# کەر لە وڵاتەکەی خۆتاندا نییە



عەزیز نەسین

وەرگێڕانی
سەعید یەحیا خەتات

**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **کەر لە وڵاتی خۆتاندا نییە**
- نووسینی: عەزیز نەسین
- وەرگێڕانی لە تورکییەوە : سەعید یەحیا خەتات
- نەخشەسازی ناوەوە: تەها حسێن
- بەرگ: جێگر عەبدولرەحمان
- ژمارەی سپاردن: ( ٦٥٩ )
- نرخ: ( ٢٠٠٠ ) دینار
- چاپی یەکەم : ٢٠١١
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆک)

**زنجیرەی کتێب ( ٥١٨ )**



**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

# جانەوەری بابی عالی

بەڕێزان.. وشەیەك لە فەرهەنگدا هەیە پێی دەڵێن عەیب..ئەم وشەیەتان بەر چاو نەکەوتووە؟ دەڵێن ویژدان نیوەی ئایینە، وازی لێ بێنە تەنانەت ئەگەر چواریەکیشی بێ، نەدەبوو ئەم هەموو شتانەم لەسەر بنووسن..ئەم هەموو ڕق و کینەیە لەپای چی؟ من لەوەتەی هەم پێم لە پێی کەس نەناوە.

دووای ئەوەی کتێبی (عەزیز نامە)م بڵاوکردەوە، بەدووام دەگەڕان،گیرام و شەش مانگی ڕەبەق لە گرتووخانەیان پەستام.هۆی زیندانی کردنم ئەو شکاتانەی لە لایەن وەزارەتی دەرەوی هەر یەك لە ئینگلتراو میسروئێرانەوە لێم کرابوون ،دووای شەش مانگ ئازاد کرام.

با بەیەکەو ئەو هەواڵانە بخوێنینەوە کە ڕۆژی دەسگیرکردنم لە ڕۆژنامەکاندا بڵاوکرانەوە. یەکێك ئەمەی خوارەوەی نوسیبوو:

دوێنی شەو دووای گەڕانێکی زۆر پۆلیسی نهێنی عەزیز نەسینیان لە چایخانەیەکدا گرت، قژو ریشی درێژی دەسکردی دانابوو.عەزیز نەسین هەوڵی دابووخۆی بەدەستەوە نەدا بەڵام نەیتوانی و بە کەڵەبچەکراوی ڕەوانەی گرتووخانە کرا.

ڕۆژنامە نووسێکی دیکە ئاوای نووسیبوو:

عەزیز نەسین لە ئیفادەکەیدا بە پۆلیسی گوتووە:(زۆربەی کاتەکانی خۆی لە چوڵەوانی وباخچەو ئەو چایخانانەدا بەسەر دەبرد کەتا بەیانی داناخرێن.)

با نووسینی ڕۆژنانووسێکی دیکە بخوێنینەوە:(لەوانەیە عەزیز نەسین رایکردبێتە دەورەوەی وولات... دووا جار لەو کاتەی دەیویست بچێتە یەك لە بارەکانی(قەرە کۆی)ی دەسگیر کرا.)

با ئەم نووسینەیش بخوێنینەوە: ( هەرچەندەی پۆلیس ناوچەکانی(قاسم پاشا) و(بەی ئۆغلو) و(تەقسیم)ی بەوردی دەپشکنی و بەدووای کەسانیچەپرەو بوون بەڵام بە هیچ شێوەیەك نەیاندۆزیەوە.دووای چوار مانگ گەڕان و پشکنین ئاسایش توانی عەزیز نەسینی راکردوو لە یەکێ لە مەیخانەکانی بەندەرگەی (قازی کۆی)دا بگرێ ،لەو کاتەی لەگەڵ سێ دۆستی خەریکی خواردنەوە بوو، عەزیز ئەوەندە مەست بوو تەنانەت نەیدەتوانی لەسەر پێ بووەستێ)

پەح.. کەواتا کابرا زۆر ترسناکە !

کە رۆژنامەم دەخوێندنەوە لە خودی خۆم دەترسام.ئاخۆ من جانەوەری(ئەنقەرە)م یا جانەوەری(بازاڕی ئەدەنا) یا جانەوەری(یەندە)م یا جانەوەری نوێی بابی عالیم؟
هەندێ رۆژنامە لەم دووایییەدا نووسیویانە کە بە هۆی ئیهانەکردنی نەتەوەی تورك گیراوم..
بەڵام خۆ ئێوە دەزانن بۆ وایان نووسیبوو..وا راستی مەسەلەکەتان بۆ بەیان دەکەم:
بۆچی رامکردبوو؟ لە دەست کێ رامکردبوو؟ ئەمەم لەبەردەم دادگادا روون کردەوە.
ژوورێکم لە یەکێ لە خانووەکانی (قازی کۆی ) بەکرێ گرت و تەواوی رۆژەکانی خۆم بە خوێندنەوەو نووسین دەبەردە سەر بێ ئەوەی نەکەس ببینم و نە قسە دەگەڵ کەس بکەم.سوودم لەو پەندە وەرگرتبوو کە دەڵێ: وەك چۆن شەیتان ناچێتە پەرستگا، پۆلیسیش ناچنە کتێبخانە..زۆربەی کاتم لە کتێبخانەکانی ئیستانبوولدا بە خوێندنەوە بەسەر دەبردن.
پاش ماوەیەك لە کاری بەردەوام و تەنیایی بێزار بووم .لەو کاتەی بە نێو کوچەو کۆلانەکاندا پیاسم دەکرد بیرم لە بەکرێگرتنی خانووێکی سەربەخۆ کردەوە، کە بتوانم بێ ترس و لەبارودۆخێکی هێمندا کاربکەم تا ئەو کاتەی شانس بەرووم پێدەکەنێ ودەرگای خێرم لێ دەکرێتەوە.
بەم بیرۆکانەوە روەێشتمە قازی کۆی.گوێم لە شەپۆڵ دەبوو کە لە بەردی کەنار دەریای دەداو گزەبای فێنك قژمیان دەجوولاندەوەو تیشکی مانگ لە نێو ئاو دەدرەوشایەوەو لەبەر دەمیشم ئیستانبوولێ بە هەموو رووناکییەوە.لەنزیکمەوەیش گازینۆیەك دەنگی موزیکی لێ بەرز بووتەوە.
لە دڵی خۆمدا گوتم:
کاتی ئەوە هاتووە کەمێ بحەسێمەوە. وەکو بشزانم ئەحمەد براکم و مەحموود یەساری مشتەریی ئەم گازینۆیەن.پازدە لیرەم لە گیرفاندا بوون و یەکسەر خۆم کوتایە ژوورەوە..
- بیرەیەك و هەندێ پەنیرو کاڵەکێکی زەردم بۆ بێنە.
ئیدی رابوێرەو کەیف بکە.ئەو کاتە تەمەنم لە سەرەتای چل ساڵیدا بوو.
هیچم لێ کەم نەبووتەنیا ئافرەت نەبێ. غەرقی دەریای خەون بووم. دەستی راستەم درێژکردو کورسی تەکم لەباوەش گرت و خەون بە خۆشەویست دەبینم. گوێم لە لای موزیکەو چاوم بڕیونەتە رووناکیی ئیستانبوولێ و بازووم لەسەرشانی خۆشەویستمە.

- گارسۆن بیرەیەکی ئەڵمانی بێنە .
بە خۆمم دەگوت، هیزە فرسەتە رابوێرە رەنگە ئیدی دەرفەتی وات بۆ هەڵنەکەوێ. لەو کاتەدا، کورسیی باوەشم جوولاَ..هەستم بەگەرمایی لاشەی مرۆڤیك کرد. بۆ ئەوەی لەخـەیال دانـەبڕێم، ئاورِم نەدایەوەو لە دڵی خۆمدا گوتم: ئەوەی بیرت لێدەکردووە وا بە پێی خۆی هات!.
پاشان دەنگێکی ناسکم گوێ لیٚ بوو:
-عەزیز بەگ..
-گیانەکەم..
-عەزیز بەگ
رۆحەکەم..
کەچی دەنگ وورد وورد گۆڕاو درشت بوو:
-عەزیز بەگ!
-ئەمرکە جگەرو هەناوم..
-بەیەکەوە دەچینە بەڕێوەبەرایەتی!
سەرم وەرگێڕا، وام زانی یەکێ لە فەرمانبەرانی هۆبەی یەکەمە، گوتم:
-ئەمڕۆ شەممەیەو نامەوێ دوو دانە شەو لە بەڕێوەبەرایتدا بمێنمـەوە،تکا دەکـەم وازم لیٚ بێنـە رۆژی دووشەممە بە پێی خۆم دێم.
-نابێ.
-باشە با ئەم بیرەیە تەواو بکەم..
-نەخێرنابێ.
کابرا لوتفی نواندو سووربوو کە دەبێ حیسابی خواردنەوەکەم بدا بەلاَم ئایـا قـەبووڵی دەکـەم! بەیەکەوە رۆیشتین وتا گەیشین قسەمان کرد.ئەمە تەواوی رووداوەکەیە.

**پەراوێز:**

ئەم حیکایەتە راستییەولە ساڵی١٩٤٨دا رووی داوە. ئەوکاتــە وولاٚت لــەژێر دەســەلاٚتی تاکــە حزبدا دەژیا کە حزبی گەلی کۆماری بوو.. لەڕاستیدا رۆژانێکی سەخت بوون.

پاشــان سســتەمی فــرە حزبــی پەیــدا بــوو حزبــی دیمــوکرات دەســەلاٚتی وەرگــرت و ئــەویش لەچەوساندنەوەی گەل تەخسیری نەکرد.ئەرکی ئیێمــەوانان ئــەوە بــوو دژی گەنــدەڵی وکەســانی گەندەڵ خەبات بکەین و رووی قەڵمان ئاڕاستەی رەخنگرتن لە دەسەلاٚتی نویٚ کرد.

ساڵی ١٩٥٩ پاڵەپەستۆی زیادمان کرایە سەر.رۆژێکیان لە قازی کۆی یەوە  بەسواری کەشــتی دەرۆیشتمە ئیستانبووڵ لەدوورەوە چــاوم بــە هــەمان پۆلیســی نهێنــی کــەوت کــە بەســەرهاتم بۆگێڕانەوە ئەو لە پلەی نایابدا دانیشتبوو،خۆم لێی نــەناس کــرد بــەوەی کــە نــەمبینیوەو لــە سالۆنی کەشتیدا دانیشتم.لەبەر ئەوەی دەساڵ بەسەر ئە رووداوە تێپەر بــووە مەزەنــدەی ئــەوەم دەکرد کابرا کرابێتە یاریدەدەر یا سەرۆکی بەش.

لێم نزیك کەوتەوەو لە تەکم دانیشت و پەسنی نووسین و خەباتی منی دژ بــە دەســەلاٚت کــرد و ئەوەندەی نەمابوو بمگەیێننە کەشکەلاٚنی ئاسمان.

کابرا یەکێك بوو لەهەرە توندڕۆیەکانی حزبی گــەلی کۆمــاری و خراپــەی حزبــی دەســەلاٚتداری دەگوت.پاشان پێی گوتم:(تۆ ئەو شێرە بووی کە نیشتمانت رزگار کرد).

زۆرم لا سەیر بوو، سەیرتریش ئەوەبوو کە گوتم:

-ئێستا سەرۆکی بەشی؟

گوتی:

-نەخێر قوربان دەمێکە وازم لــە پیشــەی پۆلیســی هێناوە..چــۆن دەتــوانی لەگــەڵ ئەمانــەدا کاربکەی؟ بەندە ئێستا بەڵێندەرم و خانووبەرە دروست دەکەم و دەیانفرۆشمەوە.بــەلاٚم کەرســتەی خاو نرخیان گرانەو لە بازاڕدا دەسناکەون..

لای پەرد لە یەکتر دابڕاین و تاوێکی خۆش وەستام وبیرم لەو کۆنە پۆلیسە بەڵێندەرە نوێیە کردەوە.

ئەم رووداوە مایەی سەرســام بــوونم بوو،بــەلاٚم کــیٚ دەزانــیٚ ؟رەنگــە ئێــوە بــە رووداوی وا سەرسام نەبن!

# حیکایەتێکی چینی

سەرۆکی بەشی سیاسەت، پێوەندیی بە (سوتیانگ) ی پـۆلیس کـردو داوای لێگـرد ئـەرکێکی یەجگار گرنگی ئەرکەکانی ئاسایشی سیاسی بەجێ بێنیّ و ئەگەر تێیدا سەرکەوت..

سوتیانگ بەشەرمەوە سەری بەرز کردەوەو پرسیاری لە بەرپرسەکەی کرد:

- گەورەم پاداشتم دەکەی؟

- بێگومان..ئەگەر لە کارەکەتـدا سـەرکەوتوو بـووی دوو هـەزار یـەنت دەدەمێ..ئێسـتایش گوێچکەکانت بکەرەوەو بزانە چ دەڵێم..

سەرۆکی بەش بێ وەستان ئەرکی بۆ سوتیانگی پۆلیس شەرح دەکرد، کەچـی پـۆلیس خـەیاڵی لای ئەو دوو هەزار یەنە بوو کە وەریان دەگرێ..پارەیەکی یەجگار زۆرە بەڵام کە دەچێتە بـازاڕ هیچیان پیّ ناکڕیّ.

بێگومان (سوتیانگ) لە ئەرکەکەیدا سەرکەتوو دەبێ بەڵام پارەکە کەمە.

سەرۆك پرسیاری لێکرد:

- ئامادەی ئەو خولە بووی کە (جاك تۆڤێل)ی پۆلیسی نهێنی ئەمریکی سازی دابوو؟

بیری سوتیانگ مەشغوولّی پارەیە، وەڵامی دایەوە:

- فەرمووت چی گەورەم؟

سەرۆك دووبارەی کردەوە:

-پسپۆڕی ئەمریکی..

- ئا بەڵێ..بەڵێ..بەرزتریان نمرەم لەو خولەدا بەدەستهێنا.

- من لە تۆ دڵنیام.گوێ بگرە سوتیانگ..جل و بەرگت دەگۆڕی و خـۆت دەکەیتـە سـواڵکەرو لەگۆشەیەکی ئەو باڵەخانە رەنگ ئاسمانییەدا کەدەکەوێتـە گـەڕەکی(یۆکۆنگ) لـە بەیانییـەوە تاکو ئێوارە دەوەستی..تێگەیشتی؟

- قوربان تێگەیشتم.لەخۆی ئاسانتر نیە ببمە سواڵکەرێکی راستەقینە!

- دەمەوێ شناسنامەی هەموو ئەو کەسانە بزانی کە دەچنە باڵەخانەو دێنە دەرەوەو ئێوارانیش راپۆرتێکم لێت دەوێ.

- ئامادەم گەورەم.
سوتیانگ وا خۆی گوڕی هەرکەسەی دەیبینی وای دەزانی سوالّکەرەو ئەگەر تەواوی وولاّتی چین بپشکنن سوالّکەری وا نادۆزنەوە.
یەکەم رۆژی وا سوتیانگ دەستی بە سوالّکردن کرد، سەرۆکەکەی لەبەر دەمیدا تێپەڕبوو پێنج دانە یەنی ئاسنی لە چنگ ناو بە ئاسپایی گوتی:
- پیرۆزباییت لێدەکەم سوتیانگ ،ئەگەر خودی خۆم ئەم ئەرکەم پێ نەدەسپاردی نەتمدەناسییەوەو وامدەزانی بەڕاستی سوالّکەری.
ئەوندە پارەیان لە دەستی سوتیانگ نا کاتی ئەوەی نەبوو چاودیریی بالّەخانە بکا.ئەم وولاّتە هەژارە چەند خەلّکی خێرخوازی لێ هەن کە بیر لە مسکێن و نەدەداران دەکەنەوە!
سوتیانگ لەگۆشەیەکی بالّەخانەکەدا دانیشت و دەسەسڕێکی لەبەردەم خۆی پانکردەوە،ئەوەندەی نەبرد دەسەسڕیان پڕ پارە کرد.
سوتیانگ سەری سوڕما،ئەو مووچەیەی مانگی جارێك لە وەزیفەی پۆلیسی وەری دەگرێ وبێ وەستان شەوو رۆژ وەستانی نیە ، بە سێ رۆژی سوالّکەرییەوە پەیدای کرد!
سەرەتای حەفتەی دووەمی چاودیریی گوێی لە دەنگی فیت فیتەیەك بوو:
- سوتیانگ تا ئەمڕۆ تاکە راپۆرتێکیشت پێشکەش نەکردووە!
سوالّکەر سەری هەلّبڕی و بەترس و لەرزەوە گوتی:
- تکات لێ دەکەم..سبەی ئێوارە راپۆرت پێشکەش دەکەم.. خەلّکینە خێرێکمان پێ بکەن.. گەورەم راپۆرت پێشکەش دەکەم..خێرێك بەمسکێن و هەژاران بکەن..
سەرۆك وەلاّمی ئەم دەمەتەقێیە جفرەیەی دایەوە کە خەلّکە خێرکەرەکە تێی ناگەن.
- چاوەڕوانی راپۆرتم.
یەك مانگی رەبەق سوتیانگ سوالّی کردو قەتاو قەت بەخەیالّیدا نەدەهاتەوە ئەو هەموو پارەیە کۆدەکاتەوەو بەتایبەتی کە کارێکی ئازادو ئاسانەو دەتوانێ هەر کاتەی حەز بکا بیکا یا نەیکا.
سوتیانگ بڕیاری خۆی داو رۆیشتە لای سەرۆکی بەش.
سەرۆك پرسیاری لێکرد:
-هەر چەندە زۆریش دوواکەوتی بەلاّم هیوادارم ئەنجامەکەی خێرو بەسوود بێ.
سوتیانگ وەلاّمی دایەوە:

- فەرموو ئەمە راپۆرت.

کە سەرۆك کاغەزی خوێندەوە رەنگی بزرکا،چونکە ئیستعفای سوتیانگی دەخوێندەوە!

سەرۆك گوتی:

-شێت بووی؟ ماوەیەکی کورتت ماوە خانە نشین دەکرێی، ئەو هەموو سالآنەی خزمەتت بۆ بە فیڕۆ دەدەی؟

سوتیانگ گوتی:

- نامەوێ..

- تۆ مرۆڤێکی ئەزموونداری و شارەزای ژیانی.

- قەیدی ناکا،جەهەندەم..

سەرۆك دەستێکی لەسەر شانی سوتیانگ داناو دیقەتێکی پۆلیسییانەی تیژی دا وەك مێشکی بخوێنێتەوەو گوتی:

- سوتیانگ ناتوانی فێلّ لەمن بکەی.. شتێکت لە ژێر سەرە!

سوتیانگ بە گومانەوە سەیری سەرۆکی کردو پارچە کاغەزێکی لە گیرفانیەوە دەرهێنا کە هەموو ئەو پارانەی رۆژانی سوالّکردن دەستی کەوتوون تیایدا تۆماری کردوون و گوتی:

- بە هۆی تۆوە ئەم هەموو پارانەم دەسکەوتن هەر بۆیە ئیستیقالە دەدەم و لە تۆ بترازێ بەکەسم نەگوتووە هیوادارم تۆیش لای کەس باسی نەکەی.

سەرۆك تەماشای سوتیانگی کردو گوتی:

- ئەمان سوتیانگ تکایە بەکەس نەڵێی و با ئەم نهێنییە لە نێوانماندا بمێنتەوە ... سبەینێ بەندەیش لە گۆشەیەکدا وەکو تۆ دەست بەکار دەبم.

# گومانم هەیە

کە ماڵەفەندی لە ساڵانی هەوەڵی شەڕی یەکەمی جیهان، لە کۆمپانیایەکدا ژمێریاربوو. ئەو سەردەمە زۆر زەحمەت بوو مرۆ خێزانێکی پێنج کەسی بە خێوبکا.. بەڵێ پێنج دانە کەس بخۆن و بخۆنەوەو دەبەر بکەن. کەماڵ رووداوێکی بەسەرهات پێوەندی بە خودی خۆی و ئیشوکاریەوە هەبوو وەکو ژمێریار.

رۆژێکیان خاوەن کۆمپانیا کە پیاوێکی بێ بەزەیی ودڵڕەق بوو بەدوای نارد. کەماڵ ترس دایگرت بەوەی یارۆ پێوەندی بە پۆلیس و دادوەری گشتییەوە کردبێ، کەچی بە پێچەوانەی بیرکردنەوەی ئەو ،کابرا گەلێ لوتفی نواند.. بۆیەکەم جار دووای نۆ دانە ساڵ کابرا بەدەمی بە پێکەنینەوە دەیدوێنێ:

- فەرموو کاکە کەماڵ دانیشە.

کەماڵ وەبان کورسی بەرانبەری هەڵتوتکا.

- کاکە کەماڵ بەندە بە پێی توانا دریغیم لە یارمەتی تۆ نەکردووە.. ئەوە نۆ دانە ساڵە نانی من دەخۆی، منداڵ و خێزانت لەخێرو بیری مندا غەرقن.. کە هاتیە ئێرە مووچەت حەفتاو پێنج لیرەبوو،کردمە نەوەت.. پێم ناڵێی لەوە زیاتر چت بۆ بکەم؟ چۆن زاتت کرد ئەم کارە بکەی؟ ئایا شایانی ئەوەم وا چاکەم بدەیتەوە؟

کەماڵ بە ئاخاوتنی نەرمی خاوەن کۆمپانیا هێور بۆوە، پێی وابوو دەیبوورێ . چاوەکانی وەسەر پێڵاوە دڕاوەکانی خۆی هەڵنەدەگرت، گوتی:

-قوربان هەقی خۆتانە، هەرچی بێژی هەقە.. منی بێوەفاو سپڵە کارێکی نەنگ و ناپیاوانەم کرد، گەلێ پێویست بووم بۆیە پەنجا لیرەم لە قاسە برد، تەمام وابوو لە ماوەیەکی کورتدا بیانگەڕێنمەوە، ئێستایش تکا دەکەم مووچەی ئەم مانگەم ببڕە.

کابرا ئەبرۆکانی زیت کردنەوەو قیژاندی:

-نەخێر نابێ.. ناتوانم چاوت لێ بپۆشم .. نەخێر نابێ.. کەماڵەفەندی لەخەو هەڵسە، منیش کارێکی چەشنی تۆم بەسەر هاتووە.لای کابرایەکی شەللاتی بە مانگانەی چل لیرە

نووسەربووم.کابرا گارسۆنی بارِی بە پەنجا لیرە بەخشیش دەکرد ،کەچی لەسەردە دانــە لــیرە لــە گرتووخانەی پەستام .. نەخێر کەماڵە فەنی نابێ، پێویستە سزای خۆت بکێشی.

کەماڵ سزا دراو ساڵێکی رەبەق لە زیندان پاڵی دایەوە، ماڵ و منداڵی لە سەر دورمانی فانیلەو گۆرەوی دەژیان.

کە لە زیندان هاتەدەرەوە ماکینەیەکی دورمانی گۆرەوی پەیـداکرد، دووای ماوەیــەك بوونــە دووان و سێیان.. پاشان سەنتەرکی چنینی دامەزراند، خۆی و ژنی و کورِو کچەکانی کاریــان تێدا دەکرد. کار پەرەی سەندو گەیشتە ئەوەی لە (تــۆپ قــاپی) کارگەیــەکی چــنینی پێــنج هۆبەیی دابمەزرێنیێ.

کە شەرِی یەکەمی جیهان کۆتایی هات،کەماڵەفەندی خاوەن کارگەیەکی گەورەی رستن و چــنین بوو زیاتر لە سەدو چل کرێکارو فەرمانبەری بەخۆیەوە دەگرت.

بەیانییەك کە پەیتا پەیتا فەرمانبەرو کرێکار دەهاتنە کارگە، سەرسـام بــوون بــەوەی دەرگــای قاسەی پــارە کــە لــە نهــۆمی ســێیەمی بەشــی کارگێرِیــدا بــوو، کراوەتــەوە.. دەســت بــەجێ کەماڵەفەندیان ئاگادار کرد ، کە لەباوەشی ژنی دووەمــی لــە گــەرِەکی (جیهــانفیر)دا پرخــەی خەوی بوو. یەکسەر سواری ئۆتۆمبیلە (بیوك)ــە زەردەکەی بوو ، کە گەیشــتە کارگــە پــۆلیس خەریکی لێکۆڵینەوە بوون.

بەرِێوەبەری کارگە راپۆرتێکی پوختی لەمەرِ دزیەکەوە دایە.پارەی نێو قاســە بەســەدو حــەفتاو هەشت هەزار لیرە مەزەندە دەکرا. کەژمێریار پارەی ژمارد دەرکەوت تــەنیا ســێ ســەدو پــەنجا لیرەی کەمەو پارەو سەنەدو کومپیالەو شتی دیکە دەستیان لێنەدراون.

پۆلیس ئەوەی ناوی بەڵگەیە چنگی نەکــەوت . کــاتی ئێــوارە پشــکێنەری نهــێنی ســڤیل کــە لێکۆڵینەوەی لە ئەستۆدایە ،گەیشت وگوتی:

-تا ئێستا ئاسەواری دز نادیارە، بەڵام بەندە گومانم لە نۆبەتداری شەوانەیە.

کەماڵ قسەی پشکێنەری برِی و گوتی:

-نۆبەتدار دزی ناکا..کابرا بوخچەی نەکراوەیەو لە کارگە دەنویێ و ئەوەندە پێویســتی بــە پــارە نیە،بۆیە دزی ناکا..پاشان نۆبەتدار چەند رۆژێکە لە گوند گەرِاوەتەوە.

- کەواتا بەردەستەکەتانە..

-نەخێر ئەویش دزی ناکا، چونکە ئەو رۆژە مووچەم داوەتێ کە سەدوپەنجا لیرەیە.. ئاگاداریشم یارۆ پارچە بچکۆڵەکانی کوتاڵ دەدزێ و مووچەکەی دەگەیەنێتە چوارسەد لیرە، بۆیە دەست بــۆ

قاسه نابا..

- لەوانەیە یەکێ لەکرێکارە کۆنە دزەکان بێ..

-نا کرێکار پارە نادزێ.. گریمان دزی ، بۆچی تەنیا سێ سەدو پەنجا لیرە دەدزێ؟ بۆ تەواوی پارەی نێو قاسە لووش ناکا؟

پشکێنەر ناوی چەند کرێکارێکی خاوەن رابردوو لە دزی و رێگری ژماردن و کەماڵ یەکە یەکە بەرگری لێکردن. لە کۆتاییدا پشکێنەر پرسیاری لە کەماڵ کرد:

- گەورم گومانت لە کێیە؟

کەماڵ کەمێ بیری کردەوەو گوتی:

- تەواو، دۆزیمەوە، دزی سێ سەدو پەنجا لیرەم دۆزیەوە.. بەڵێ خۆیەتی..

- کێیە گەورەم؟

- کوڕەلاوێکە نێو(زەکی) ، لەبەشی ژمێریاریدا کار دەکا.. ئەوە خۆیەتی.

- گەورەم بەندە لێکۆڵینەوەم لە گەڵ تەواوی کارمەندان کردووە، کە باسی زەکیم کرد جەنابتان پەسنی رەوشت و ئەخلاقی ئەوتان کرد کە زۆر لە کارەکەی خۆیدا دڵسۆزە .

- ئەوە خۆیەتی..

-ئاخر..

- دەڵێم دزی پارە زەکی یە..

- بەڵگەتان هەیە؟

- بەڵی بەڵگەی بە هێزم هەیە.. ئەو کوڕە رۆژانە دە سەعات کار دەکاو ماندوو دەبێ، کەچی لە کۆتایی مانگ تەنیا سەدو هەشتا لیرە وەردەگرێ..ئەمڕۆ باربەرو کرێکاری گەڕۆك وسەرپێ مانگی زیاتر لە پێنج سەد لیرە وەدەست دێنن. جا ئەگەر زەکی دزی نەکاچ بکا؟

- ئاخر گەورەم..

- نا ..نا.. گومانم هەیە..چۆن دەتوانێ بژێوی دایك و ژن و سی منداڵ بە سەدو هەشتا لیرە دابین بکا؟ خۆ ئەم پارەیە بەشی نانیان ناکا.. جا ئەگەر دزی نەکا چ بکا؟

- رەنگە وابێ..

- گومانم زۆرە.. کرێی خانوو، کرێی هاتوچۆ ، جل وبەرگ، سەدو هەشتا لیرە بەشی چ دەکا؟ دز خۆیەتی..

- ئاخر..

- ڕۆژی هەزاران لیرە وەردەگرێ و لە قاسەیان دەئاخنێ و سەری مانگ مووچەی سەدو هەشتا لیرەیە!
پشکێنەر بەرگری لە زەکی دەکرد.. کە کەماڵ بەدووای نارد زۆر شەپڕێوانە هاتە ژوورەوە.
- فەرموو کاکە زەکی.
کوڕیژگەی قەڵەوی کورتە باڵا دەمو چاوی زەرد هەڵگەڕاو، وەبان کورسی موت بوو، کەماڵ بە شەوقەوە دەستی پێکرد:
- کاکە زەکی ، ئەوەی لە دەستم هاتبێ دریغیم نەکردووە، شەش ساڵە نانی من دەخۆی.. لە کارگە بە مووچەی سەدو بیست لیرە دامەزرای، بۆتم کردە سەدو هەشتا.. ئیدی پێم ناڵێی چت بۆ بکەم؟چۆن وا بێشەرمانە سێ سەدو پەنجا لیرەت دزی؟هیچ ویژدانت ئازاری نەدای؟
فەرمێسك لە چاوەکانی زەکی قەتیس مابوون، بەدەم گریانەوە گوتی:
- هەقی خۆتانە گەورەم.. کارێکی ناشایستەم کرد.. زۆرم پێویست بە پارە بوو، ناچار سێ سەدوپەنجا لیرەم لە قاسە دەرهێنا پێم وابوو کە س پێی نازانێ..ئێستایش فەرموون مووچەی دوو مانگم ببڕن.
- کەماڵ قیژاندی:
- نەخێر نابێ..زەکی یەفەنی چاوەکانت بکەرەوە.. کاتی خۆی لای کابرایەکی بێ ویژدان و بێ نامووس کارم دەکرد.. چل هەزار لیرەی لە سەر مێزی قومار دادەنا باکی نەبوو، کەچی پەنجا لیرەم لە قاسە برد تووشی زیندانی کردم.. دز دەبێ سزای خۆی وەربگرێ..
زەکی لەبەر دەم پشکێنەری نەهێنی پێی لە تاوانی نا.. دوو پۆلیس وەپێش خۆیان داو بردیان، کەچی کەماڵ حەجمانی نەبوو، وەکو جانەوری حایج ئەملاو ئەولای دەکردو لە داخا دەیقیژاند.پشکێنەر لێی نزیك کەوتەوە هێوری بکاتەوە، گوتی:
- جا گەورەم بۆ وا تووڕەی؟ کابرا پارەیەکی ئەوتۆی نەبردووە، ماشەڵڵا حاڵتان خۆشە، پاشان دز دانی بەتاوان ناو سزای خۆی وەردەگرێ!
کەماڵە فەندی گوتی:
- مەسەلە سێ سەدو پەنجا لیرە نیە..من بە دەستی خۆم مرۆڤێکی دیکەم دروست کرد..هەمان رووداوی بەسەر مندا هات وا دووبارە دەبێتەوەو ئەنجامەکەی دەزانم.. منیش جاران وەکو ئەو بووم و ئەمڕۆ بوومەتە ئەم پیاوە..ساڵێك ناخایەنێ ملیۆنێرێکی دیکە لە جیهانی پارەو پووڵدا لە دایك دەبێ ودەبێتە رکابەری من .. بۆیە تووڕەم..
ئەری ئەم فەرمانبەرانە بۆ بە دڵسۆزی کارناکەن؟!

# ئەو  وڵاتە لە کوێیە؟

ناوە ناوە ڕۆژنامەکانی جیهان باس لە سەروەت وسامانی سەرمایەدارو گەورە دەوڵەمندان دەکەن . مستر جوزێف .ك. کرافتسمان یەکێکە لەو زلدەوڵەمەندانە. کابرا لەبەر ئەوەی خاوەنی جۆرەها کۆمپانیاو دەزگایە،نازانێ چەندی پارە هەیە.. ئەوەندەی کارتلی زلکۆمپانیا هەن ، ناوی زۆربەیان نازانێ. بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری، پشتی بە دەستەیەك لە باشترین پسپۆڕی ئابووری و خەزنەدارو زانای کۆمەڵناسی و بیزنسسمان و بەڕێوەبەری پرۆپاگەندە بەستووە.ئەمانەیش بەردەوام هەوڵ دەدەن وکۆشش دەکەن لە پێناو زیادکردنی سامان و بەرەو پێشبردنی بەرهەم.

مستەر جۆزیف.ك. کرافتسمان هەموو کەرەستەی خۆشترین ژیانی لەم دنیا جوانەدا دابین کردووەو لەو پەڕی خۆشیدا دەژی.لەو خۆشییانەی ئێوە هەندێکیان دەزانن و بەڵەدی هەندێکی دیکە نین .کابرا لە شوێنی زۆر جوان ودڵگیر ژیاوە بەڵام لە هی دڵگیرتر دەگەڕێ. گەلێ ژنی جوانی هێناون، بەڵام لە هی جوانترو شۆختر دەوێ.لەم ڕووەوە هەمیشە هەست بە برسێتی دەکاو لە جوانان تێر نابێ.سەرەڕای ئەوەی کە لەماوەی ئەم دووایيدا بایەخ بەوە دەدا بزانێ کام شوێن لەم دنیایەدا جوان و دڵڕفێنەو مرۆڤی باش لە کوێ دەژین.

بۆ ئەم مەبەستە مستەر (هارد) ی ڕاوێژکاری تایبەتی خۆی ڕاسپارد کە شوێن و خەڵکانێکی وای بۆ بدۆزێتەوە .

ڕاوێژکاری تایبەت دەستی بە گەڕان کردو زۆربەی هەرە زۆری وولاتانی سەر ڕووی زەوێ بەسەر کردەوە، بەڵام بەداخەوە ئەو شوێنەی نەدۆزیەوە کە مستر جۆزیف بە دڵی بێ. خەریك بوو نا ئومێد بێ کە ڕووی لە وولاتێك کرد قەت نەیدیبوو. هەرکە گەیشتە ئەوێ زۆری بەدڵ بوو، زانی مستەر جوزێفیش بە دڵی دەبێ ، چونکە خەڵکەکەی لە ئەندازە بەدەر باش و دڵساف و بێ خەشن و وولاتەکەیش یەك پارچە جوان و دیمەنی دڵڕفێن.

وەکو باوەیشە مستەر هارد دەگەیشتە هەر وولاتێك نامەی بۆ کرافتسمان دەنووسی و باسی ئەوێی بۆ دەکرد. چونکە ئەم وولاتەی زۆر بە دڵ بوو ، نامەیەکی لە شێوەی ڕاپۆرت بۆ ڕەوانە کرد، ئەمە دەقەکەیەتی:

گەورەم مستەر جۆزێف .ك. كرافتسمان

لە سەر داخوازی بە ڕێزتان ماوەی دوو ساڵی ڕەبەقە بەندە بە دووای وولاتێكم سروشتی جوان بێ و خەڵكەكەیشی باش و مرۆڤ دۆست بن . پێموایە بەڕێزتان لـە بـەر روونـاكی راپۆرتـەكانی پێشووم هەستتان كرد كە بە داخەوە هیچم نەدۆزیەوەو زۆریشم خەمخوارد بەوەی كـە دووای ئـەم هەموو سەفەرو هاتوچوونە ئەنجامێكی باشم وەدەسـت نـەهێنا. دان بـەوەوە دەنـێم كـە ئەمـە یەكەمجارە لە ئیشێكی ئێوە پێم بسپێرن سەركەوتوو نەبم. لـە رێگـەی گەڕانەوەمـدا گەیشـتمە وولاتێك كە تروسكی ئومێدی لێ بەدی ناكرێ.

مستەر جوزێف.ك.كرافتسمان. رێگەم بدەن مزگێنیتان بدەمێ.ئێرە وولاتی سروشتی جـوان و خەڵكی باشە.چۆن من بە بینینیەوە سەرسام بووم ئێوەیش سەرسام دەبن.دووا جار ئەو وولاتـەم دۆزیەوە كە خەڵكی وا باشی تێدایە بـاوەڕ ناكـەن. كـە ئـەم مزگێنیـەتان دەدەمـێ ، زۆریـش خۆشحاڵم بەوەی لە ئەركەكەمدا سەركەوتوو بووم .پاش ئەوەی بەم وولاتەدا گەڕام بۆم دەركەوت كە جوانترین وولاتەو خەڵكەكەیشی تا دڵتان حەز بكا باشن . بـەلام كـە زانیمـان چـۆن دەژیـن هەست بە دڵتەنگی دەكەین. ئەو كەسەی نەشزانێ چۆن ژیان بەسەر دەبەن ن ئەوە ئەم ناوچـەیە وەك بەهەشت دەبینێ. بۆ ئەوەی ئاگاداری چۆنیەتی ژیانی ئـەو خەڵكـە باشـەی ئێـرە بـن كـە لەسەر جوانترین سروشتدا دەژین، حەزم كرد هەندێ نموونەتان بۆ باس بكەم.

دەزانم ئێوە حەز بەوە دەكەن هەندێ كات گوێ لە رادیۆ بگـرن و تەماشـای تەلـەفزیۆن بكـەن، بۆیە وا شەرحی ئەوە دەكەم كە چۆن دەتوانن گوێ لە رادیۆ بگرن و تەماشای تەلەفزیۆن بكـەن! پێویسە دوو ئامێری رادیۆو دوو ئامێری تەلەفزیۆنتان هەبێ.یەكیان بە پاتری كار بكاو یـەكیان بە كارەبا.چونكە نابێ متمانە بە كارەبای جوانترین ناوچەی دنیا بكەن كە باشترین خـەڵكی لێ دەژین..كارەبا لە كاتی دیاركراوو كاتی نادیاركراودا دەبڕێ. ئەگەر لە شار نەبڕا ئەوە لە ناوچـە دەبڕێ. تەنانەت ئەگەر نەشبڕێ لەوانەیە بێ هێز بێ. لەو بارودۆخەدا دەبێ رادیـۆو تەلـەفزیۆنی پاتری بەكاربهێنن. تەنانەت پاتریش هەمیشە جێگەی متمانە نیە و رەنگە لە بازاڕدا نـەمێنێ سەرەڕای بەرزبوونەوەی نرخی وەكو هەموو كالاكانی دیكە.بەم حالە ناتوانن نـە گـوێ لـەرادیۆ بگـرن و نـە تەماشـای تەلـەفزیۆن بكـەن و بیـزار دەبن.بۆیـە دەبـێ ئـامێری كارەبـا دروستكەر(موەلیدە) بكڕن كە رادیۆو تەلەفزیۆن ئیش پێ بكاو رەنگە ئـامێری وا لـە بـازاڕدا نەدۆزنەوەو ئەگەر دۆزیتانەوەیش و هەندێ كات سووتەمەنیتان دەسـت نەكـەوێ. ناچـار دەبـن بەتەلەفۆن پێوەندی بە دۆستێكتانەوە بكەن كە لە شارێكی دیكـەدا دەژیـو پرسـیاری ئـەوەی

لێبکەن ئاخو کارەبای هەیەو تکای لێبکەن تەلەفۆن لە رادیۆ نزیك بکاتەوەو بۆئـەوەی گـوێی لێ بگرن، لەچەشنی گواستنەوەی زیندوو. سەبارەت بە تەلەفزیۆنیش لەوانەیە کارەبـا بـبڕێ یـا پاتری وزەی تێدا نەمێنێ یا پەخش نەمێنێ. یاسـای ئێـرە رێگـەی ئـەوەتان نـادا کـەناڵێکی تایبەتی بکەنەوە، بۆیە دەبێ ئامێری فیلم نیشاندەرتان هەبێ و لە جیاتیی بەرنامەی تەلەفزیۆن تەماشای فیلم بکەن. بکورتی جەنابی مستەر جۆزێف.ك.کرافتسمان پێویستە لـە ماڵەکەتانـدا دوو رادیۆو دووتەلەفزیۆن و مووەلیدەیەك وفـیلم نیشـاندەر دابـین بکـەن. ئەگـەر ئـەم هـەموو کەرستانەتان هەبێ ناچار دەبـن یـەکێکیان بـەکار بیـنن و ئەوکاتـە گـوێ لـە رادیـۆ گـرتن و تەلەفزیۆن تەماشاکردن ، کارێکی زەحمەت نیە.

ئەگەر زانیتان باشترین خەڵکی دنیا چۆن لە جوانترین سروشتدا دەژین، هەست بە گرفتـی دابـین کردنی خۆراك ناکەن. با لە نانەوە دەست پێ بکەین..

هەندێ کات خاوەن نانەواخانەکانی ئێرە نـان دروسـت ناکـەن تـەماحی نـرخ بەرزبوونـەی دەکەن کە دەوڵەت دیاری کردووە.بۆیە پێویستە وەکو هەموو خۆراکـەکانی دیکـە بڕێکـی تەواو نان دابین بکەن. لەهەمان کاتدا کرێکار بۆیان نیە لە پێناو زیادکردنی هەقدەسـتیان ، مان بگرن. تەنانەت ئەگەر فرنیش کاربکەن و کرێکاریش مان نـەگرن، دەبـێ بەشـێکی زۆر نان لە ماڵتاندا هەبێ چونکە لە رۆژی باراندا نان پەیدا نابـێ، پێویسـتە نـانی وشـك دابین بکەن و ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو نانی وشکتان دەستنەکەوێ دەبێ ئاردتان هـەبێ و ئەگەر نانتان دەست نەکەوت ، کولیچەو کێك دروسـت بکـەن . ئەگـەر ترسـی ئـەوەتان هەبوو هەموو کاتێك ئاردتان دەست نەکەوێ ،دەبێ چەند تەلیس پەتاتە بکڕن و عـەمباری بکەن. بەکورتی دەبێ نان و نانە وشك وئاردو پەتاتان لە ماڵدا هـەبێ. ئەگـەر هـەر یـەك لەمانە لە بازاڕدا نەمان بە وانی دیکە زگتان تێر بکەن و لە جوانترین شوێنی دنیـادا کـە باشترین خەڵکی لێیە، برسی نەبن!.

با بێینە سەر مەسەلەی پێوەندی.پێویستە بۆتانی بەیان بکەم تاکو هـیچ ئاسـتەنگتان نەیەتـە رێگەو بتوانن چۆنی چارەسەر دەکەن.بەر لە هەموو شتێ دەبێ تەلەفۆنتان لە ماڵدا هەبێ. بەڵام ئاخاوتن بە یەك دانە تەلەفۆن کارێکی سەختە، ئەگەر حەز نەکەن ئەوەی قسەی لەگەڵدا دەکەن شێت بێ!بۆیە دەبێ لانی کەم دوو هیلی تەلەفۆن و سێ دانە ئامێرتان لە ماڵدا هەبێ. تەنانەت ئەگەر گوێتان لە زەنگی ئامێری یەکەم و دووەم نەبوو رەنگە گوێتان لە هـی سـێهەم بێ.بـەڵام لەمانەیش زامنتر دانانی سستەمی تەلەفۆنە لە ماڵکەتاندا (بەدداله) کە بەچەند هێلەوە بەسترا

بێ و ڕەنگە بە هێلیکەوە بتوانن قسە بکەن.ئەگەر گومانتان لە بەددالە هەبوو، پێویستە تەلێکستان هەبێ، لە گەڵ بێتەلێك کە بتوانن قسەی پێ بکەن ئەگەر تەلەفۆن و تەلێکس کاریان نەکرد.پێویستە زۆر بە نهێنی بێتەل بەکار بێننن نەبادا بە سیخوڕتان لەقەڵەم بدەن و لێتان تووڕە بن. چونکە ڕێگەی بەکارهێنانی بیتەل نادەن تەنانەت ئەگەر لە نێو بووکە شووشەی منداڵانیشدا بێ.ئەگەر نەتوانن بگەنە دایەرەی پۆستە یا درانگ بگەن و نەتان توانی نامە رەوانە بکەن ، لەسەرتان پێویستە کۆتر لە ماڵکەتاندا بە خێو بکەن ، بو ئاگاداری نامە بە کۆتر رەوانە کردن بە پێچەوانەی یاسایە.لەم حاڵەتەدا ئەگەر تەلەفۆنەکان کاریان نەکردو تەلێکس وەستاو بێتەل دەستی بەسەر داگیراو نەتانتووانی بگەنە دایەرەی پۆستە دەبێ چەند نامەبەر دامەزرێنن ئەوانەی بەپێ بە زووترین کات نامە دەگەیێنن. ئێستا ئەگەر مەسەلەی پێوەندیمان کورت کردەوە دەڵێین پێویستە تەلەفۆن و بگۆڕو تەلێکس و کۆترو نامە بەر دابین بکەن. چونکە پێویستیتان بە بەکار هێنانی یەك لەو هۆیانە دەبێ و ئەو کاتە دەتوانین بڵێین کە مەسەلەی پێوەندیتان زامن کردووە.

سەبارەت بە هۆی گواستنەوەو هاتوچۆکردنیش، ئەگەر بزانن چۆن رەفتار دەکەن ئەوە هیچ گیروگرفتتان نابێ.ناکرێ بێ ئۆتۆمبیل بن و پێویستە یەك دانە ئۆتۆمبیل نەبێ، چونکە ئۆتۆمبیل پەکی دەکەوێ و کەرستەی یەدەگتان دەسناکەوێ. بۆیە واباشە دوو ئۆتۆمبیلی بەرهەمی ناوخۆییتان هەبێ. دوور نیە یەك لەو ئۆتۆمبیلانە پەکی بکەوێ یا بدزرێ یا پارچەی یەدەگی دەسنەکەوێ ،ئەوکاتە باشترین ڕێگەچارە بۆ هاتوچۆکردن لە جوانترین ناوچەی سەر زەمین کە باشترین خەڵکی لەسەر دەژین، ئەوەیە کە لانی کەم چوار ئۆتۆمبیلتان هەبێ.هەندێ جار بەهۆی قەیرانی پانزین ،ئەو چوار ئۆتۆمبیلانەیش بەش ناکەن ،ئەو کات دەبێ ئۆتۆمبیلێ پێنجەم هەبێ و بە گاز کار بکا.جاری وادەبێ گازیشتان دەسنەکەوێ بۆیە بیر لە ماتۆڕسکلێك بکەنەوەو ئەگەر پانزینتان بۆ ماتۆڕیش دەسنەکەوت ئەوە دەبێ پایسکیلتان هەبێ. لەبەر ئەوەی ئەم وڵاتە لەبان شاخی سەخت و عاسی دامەزراوە، شەقامەکانی زۆر ڕکن و پایسکیل ناتوانێ سەر کەوێ ، پێویستە لە باخچەی ماڵدا ئاخوڕ دروست بکەن و هەندێ وڵاخ رابگرن و کورتان وزینیان بۆ دابین بکەن . هەروەها پێویستە گالیسکەتان هەبێ ئەوەی وڵاخ رایدەکێشێ.

بکورتی پێویستە تەواوی هۆیەکانی گواستنەوەتان لە ماڵدا هەبێ، ئەوانەی بە درێژایی مێژوو مرۆڤ بەکاری هێناون .ئەو کات لە هاتوچۆکردندا لە شوێنێکەوە بۆ شوێنیکی دیکە هیوا

براونابن ،لەو ناوچەیەی کە بە جوانترین سروشتی دنیا دادەنرێو باشترین و نـەجیمترین خـەڵکی لەسەردا دەژین.
با بێینە سەر مەسەلەی رووناکی. بێگومان ئێوە سـەرەڕای ئاسـتەنگ و کیروگرفـت، دەتـوانن تێیدا سەرکەتووبن. تەبیعی سوود لە کارەبای شار وەردەگرن! بەڵام چونکە نازان کەی دەبـڕێ و کەی دێتەوە، پێویستە مووەلیدتان هەبێ.ئەگەر ترسی ئەوەتان هەیە سـووتەمەنیی پێویسـتتان دەسنەکەوێ،ئەوە پێویستیتان بە چەند دانە چرای گاز دەبێ !ئەگەر ترسی ئەوەتان هەیە گازتان دەسنەکەوێ ،لایەتی دەست بەکار بێنن، ئەگەر ترسی پاتریتان هەیەو بۆ ئـەوەی لـە تاریکیـدا نەژین، پێویستە ژمارەیەکی زۆر مـۆم لـە ماڵەکەتانـدا عـەمبار بکەن.ئەگـەر کارەبـا بـڕاو و سووتەمەنیتان تەواو نەتان ویست مۆم داگیرسێنن لەترسی ئەوەی لەبازاڕدا نـەمێنێ، دەتـوانن قوتیلەو چرا ڕەشکە بەکار بێنن، ئەگەرنا چەرخی بە فەتیلە یا بەردەستێ،یا ئەو تەختەدارەی بۆ ئاگر هەڵگیرساندن کاتی خۆی بەر لە دۆزینەوەی کارەبا چەرخ و شقارتە بەکاریان دەهێنا.سـەرە ڕای ئەوەی دەتوانن ئامێری (چارچ- شحن) دابین بکەن یا سوود لە وزەی با وەربگرن و کارەبای پێ دابین بکەن.
ئەگەر بمانەوێ بەکورتی باس لەم مەسەلە ی رووناکی بکەین، لە جوانترین ناوچەی ئـەم دنیایـە کە باشترین و دڵسافترین خەڵکی لێ دەژین، پێویستە ئەم شتانە لە ماڵەکەتانـدا هـەبن: وزەی کارەبای شار، مووەلیدە،فانۆس،چرا رەشکە،لایتی دەست،مۆم،وزەی خۆرو ئەگـەر ئـەم هـەموو ئەمانەتان دابینکرد ئەوە لە تاریکی رزگارتان دەبێ.
با بێینە سەر باسی هەندێ کاروبارتان کە پێوەنـدییان بـە دایـەرەکانی دەوڵەتـەوە هەیـە.. چارەسەرکردنی ئەم مەسەلەیە لە خۆی ئاسـانتر نیـە. تەنانـەت ئەگـەر بشـزانن چـۆن لـە دایەرەی رەسمی وغەیرە رەسمی چارەسەر دەکەن، دەبێ پشت بە یەکێ لـە گـەورە بەرپرسـان ببەستن تا یارمەتیتان بدا.پێویستە ژمـارەی ئـەو کەسـانە زۆربـن بـۆ ئـەوەی لـە هـەموو شوێنەکاندا سوودیان هەبێ.بۆ ئەم مەبەستەیش پێویستە بەرتیلی چەور بـدەن . ئەگـەر بـە بەرتیل رێك نەکەوت و ئەو بـەرپرس و فەرمانبەرانـە نـەیانتووانی کاروبـار وەك پێویسـتە راپەڕێنن ، دەبێ کچی جوان و خزمـی قەشـەنگتان هـەبێ، سـەرەڕای کـارت و راسـپاردە، ئەگەرنا دەبێ دیاریی بـەنرخ و پـارەی بـاش بـدەن، بـەگوێرەی ئـەو بارودۆخـەی هاتووتـە پێشتان. ئەگەر هەر شانس نەیهێنا پێویستە بەرتیل بـدەن. لەهـەموویش گـرنگتر ئەوەیـە دەبێ خاوەن سەبرێك بن بەرد بتوێنێتەوە.

سەبارەت بە مەسەلەی گەرمکردنەوەی ماڵ، دڵنیا بن مستەر جۆزێف.ك.کرافتسمان هەرچەندەی دەزانم ئێوە بەسەر ئەو گیرگرفتەدا سەردەکەون، بەڵام ئەمەیش وەکو هەموو کرفتەکانی دیکە چارەسەری هەیە.دەبێ گەرمکەرەوەی ناوەندی لەماڵەکەتاندا هەبێ!بەڵام پێویستە سێ جۆر سستەمی گەرمکردنەوە هەبن.یەکەمیان بە نەوت کاربکاو دووەمیان بە خەڵووزی بەردین و سێهەمیان بە غاز.دەبێ دوو سستەمی خەڵووز بن ، خەڵووزی دارو خەڵووزی بەردین.واتا چوار جۆر سستەم لەماڵەکەتاندا هەبێ، ئەگەر ترستان لەوە بوو کارەبا ببڕێ و سووتەمنی ئامێرەکانی دیکە لە بازاڕدا پەیدا نەبن، ئەوە دەبێ سۆپای جۆراو جورتان هەبێ، لەگەڵ ئاگردانێك کە بەخەڵووز گەرما ببەخشێ، ئەگەر هەردوو جۆر خەڵووز دەسنەکەوتن، ئەوە پاشەرۆکی مانگا (تەپاڵە) بەکار بێنن.ئەگەر سووتەمنی هەموو ئەو ئامێرانەتان دەسنەکەوت پێویستە خەمی ئەوە بخۆن کە مەقەڵەتان هەبێ و خەڵووز لەکات و ساتی خۆیدا بکڕن و عەمباری بکەن. ئەگەر هەرنا دەبێ ئامێرێك لەسەر بانی ماڵەکەتاندا هەبێ تیشکی خۆر بهێنێتە ژوورەوەو گەرمتان بکاتەوە.پێموایە دابین کردنی ئەمانە زەحمەت نیە.

ئێستایش با بێینە سەر مەسەلەی ژنهێنان وپێکهێنانی خێزانێکی بەختەوەرو ژیان لە جوانترین ناوچەی دنیا کە باشترین خەڵکی تێدایە. ئەمە هەر زۆر ئاسانەو لەو مەسەلانە ناکا کە پێشتر باسم کردن.ئەو ئافرەتەی خۆشتان بوێ بە سڤیل مارەی دەکەن.چۆن ئەگەر ئاو بڕا دەبێ تانکیتان هەبێ یا بیر هەڵکەنن،ماڵتان بەکارەبا رووناك دەکەنەوە بەڵام مۆم و چراو لایتیشتان هەیە نەبادا کارەبا ببڕێ و بیرتان لە مەقلە و ئاگردان کردووتەوە ،نەبادا گەرمکردنەوەی ناوەندی نەبێ، ئاوایش دەبێ ژنێکی دیکەیشتان بە شەرعی هەبێ. ئەگەری ئەوە هەیە دەگەڵ ئەو ژنەیش بەختەوەر نەبن، دەبێ ئافرەتێك یا زیاتر هەبن بێ مارە بڕین لە گەڵیاندا رابوێری.ئەگەر ئەو هەموو ژنەت هەبوون لەگەڵ یەکێکیاندا هەر بەختەوەر دەبن.بەڵام ئەگەر ترسی ئەوەتان هەبوو بەختەوەر نەبن یا شانستان نەیهێنێ، ئەوە بەهیوای ئەوە بژین کە رەنگە دۆستێکی بەوەفا بدۆزنەوە، ئەوکاتە پێتان وانەبێ بەختەوەریی مەحاڵە.

لێرەدا مستەر جۆزێف .ك.کرافتسمان کۆتایی بە راپۆرتەکەم دەهێنم دووای ئەوەی بۆم بەیان کردن کە چۆن هەڵسو کەوت دەکەن، ئەگەر ئارەزووتان کرد لە جوانترین سروشتی دنیاداو لە نێو باشترین خەڵکی ئەم سەر زەمینەدا بژین.

چاوەڕوانی فەرمانتانم.
دڵسۆزتان : هارد زیگل

کە مستەر کرافتسمان نامەی راوێژکاری تایبەتییی خۆی خوێندەوە، گەلێ کەیفساز بوو.شوکر وا شوێنێکی دۆزیەوە کە تێیدا بە بەختەوری بژی و هەر ئەو دەمە ئەمری کرد بروسکە بۆ راوێژکار رەوانە بکەن:( چاوەڕوان بن وا هاتم).بەڵام بە داخەوە بروسکە ڕەوانە نەکرا، چونکە نامەی مستەر هارد رەوانەی کردبوو ئەدرەسی لەسەر نەبوو.

مستەر جۆزێف.ك. کرافتسمان زۆری چاوەڕی کرد نامەیەکی دیکەی لە راوێژکاریەوە بەدەست بگا، کەچی نە هیچ نامەیەك گەیشت و نە زانیاری. لەبەرئەوەی مستەرجۆزێف.ك.کرافتسمان سووربوو بچێتە ئەو وولاتە خۆشە ، نامەی مستەر هاردی لە رۆژنامەکاندا بلاوکردەوەو وخەلاتێکی پازدە ملیۆن دۆلاری تەرخان کرد بۆ ئەو کەسەی ئەو وولاتەی پیشان بدا کە جوانترین شوێنی دنیایەو باشترین خەڵکی تێدا دەژین.

ئێوەیش ئەگەر بە وولاتێك دەزانن وەکو ئەوەی مستەر هارد لە نامەکەیدا باسی لێوە دەکا ،فەرموون نامە بۆ مستەر جۆزێف .ك. کرافتسمان رەوانە بفەرموون ، لەلایەك چاکەی دەگەڵ دەکەن و لە لایەکی دیکەیشەوە دەبنە خاوەن پازدە ملیۆن دۆلاری ئەمریکی.

دەی کێ دەزانێ ئەو وولاتە لە کوێیە ؟!

# ئەمانە دەردەكانی ئیمەن

دوكانێكی بچكۆلانەمان بینی. بەقاڵ نەوتی لە شووشەی ژنە دێهاتییەك دەكرد.چاوی بە ئێمە كوت پێكەنی وگوتی:

- رشید ئاغا چاوەڕوانی ئێوەیە. بە دەستی لای چەپتانەوە چایخانەیە، لەوێ چاوەڕوانتانە.

پێكەنینەكەی پڕ لە مانا بوو ،گوتم:

ئەم رەشید ئاغایە كییە؟

گوتی:

- زووكەن،بڕۆن، چاوەڕوانتانە.

لە ژێر نیمچە بەرزاییەكدا چایخانەمان بینی. مێرد منداڵێك چاوی بە ئێمە كەوت، رایكردو گوتی:

-مام ەشید چاوەڕوانی ئێوە دەكا.

لەبەرزاییەوە دابەزین و خۆمان بە چایخانەدا كرد:

-مەرحەباتان لێ بێ برادەرینە.

خەڵكەكە تەماشای ئێمەیان دەكردو حریت حریت پێدەكەنین.

- رەشید ئاغا كییە؟

-ئەوەتا لەولا دانیشتووە.

لە بان تەختەیەك راكشاوە، ریش ماش و برنج، كابرایەكی رۆح سووك. ئێمەی بینی قیت بۆوەو گوتی:

-بەخێر بێن.

-سەلامەت بی.تۆ رەشید ئاغای؟

- بەڵێ منم.

-چاوەڕوانی ئێمەی وانیە؟ لە ریگادا هەركێمان بینی گوتی رەشید ئاغا چاوەڕوانتانە.

- جاری فەرموون دانیشن . چاوەڕوانین ، بەڵی . بەلاّم چاوەڕوانی ئێوە نین. خەڵكەكە واتێگەیشتوون ئێوەن.. چ دەخۆنەوە؟

داوای ماستاومان کرد.له رەشید ئاغامان گەیاند کەلــە رێگــەدا جیبمــان پــەکی کــەوت بۆیــە هاتینە ئێرەو هەرکێمان دەبینی باسی چاوەڕوانی دەکرد.
رەشید ئاغا مژێکی لە قاوەداو بە خەڵکی گوندی گوت:
-ئەوانەی چاوڕوانیان دەکەین ئەمانە نین .ئەمانەتان هیچ بینیوە؟
هەندێ کەس وەڵامیان دایەوە:
-کە چاومان پێیان کەوت زانیمان ئەوان نین.
گوتمان:
-رەشید ئاغا مەراقمان کرد، پێمان نالێی چاوەڕوانی کێ دەکەن؟
گوتی:
-پەیدا دەبن.لەهەرکوێ بن دێنەوە.
رەشید ئاغا دەسەسڕێکی لەبەردەم دانایین.لەســەرخۆ دەسەســڕی کــردەوە، چــوار دانــە پاکەتــە جگەرەی بەتاڵی دەرهێنا گوتی:
-ئێمە چاوەڕوانی خاوەنی ئەم پاکەتانە دەکەین.کە بەئەمانەت بۆمان هەڵگرتوون.
گوتم :
-ئەمانە چنە رەشید ئاغا؟
گوتی:
-ئەمانە دەردەکانی ئێمەن.
- دەردی چی؟
-بەخوا دەردی ئێمەن. ئێستا بۆتە باو کە هەڵبژاردن نزیــك دەکەوێتــەوە، خــوا نــەیبڕێ گــەورە پیاوەکانمان گوند بەگوند، ناوچە بە ناوچە دەگەڕێن و گوێ لە دەردەکانمان دەگرن.دەستەی حزبــی لەسەرحوکم هاتنە ئێرەو خــەڵکیان لــە چــایخانەدا کۆکردنــەوە. چــوار کــەس بــوون لێــرەدا لــە ئۆتۆمبیــــل دابەزین.فـــەرموومان لێ کردن.سەلامەلەیك..ئەلەیکەســـەلام.یەکێکیان گـــوتی: برادەرینە تا ئێستا کەس بەلاتانەو نەهاتووە گوێ لە دەردتان بگرێ، کەچی دیموکراســی مانــای گوێ گرتنە لە خەڵك.بۆیە وا بە پێیە خۆمانەوە هاتووینەتە لاتان. ئێوەش هەرچی هەتانە بیلێن، چ داواکاریتان هەیە پێمان بێژن.
دەستمان بە داواکاری کرد، ئەوانیش هەریەکەو لای خۆیەوە دەینووسی.هەرچی گوتمان نــەیان گوت نابێ. گوتمان قوتابخانەکەمان پێنج پۆلەو بەش ناکات.. لەئێمە داواکاری لەوان نووسین،

جگەرە لەجگەرەیش دەکێشن و چای دەنۆشن.لەسەرخۆ بەماموٚستای گوندم گوت: ماموٚستا من باوەڕی بەمانە ناکەم گوتی کوڕە ئەم قسەیە چیە؟ گوتم : راوەستە تاقییان دەکەمەوە. گوتم: برادەرینە ئێوە هەموو داواکاریەکانی ئێمەتان نووسی، تەنیا شتیکمان ماوە.. ئەگەر هێلی شەمەندەفەرمان بوٚ راکێشن ئەوە هیچی ترمان ناویٚ. وەڵلا ئەویشیان لە پاکەتە جگەرە نووسی.

تاقی ئێوارە دووانیان جگەرەیان تەواو بوو پاکەتیان فڕەدا.هەردووکیانم هەلّگرتنەوەو بەدزی خستمنە گیرفانم.وادەی رۆیشتن لەبەردەم چایخانە یەکێکی دیکە پاکەتی فڕەدا.ئەویشم خستە گیرفان. کە سواری ئوٚتوٚمبیل بوون دەستیان لەپەنجەرەوە دەرهێناو خواحافیزیان کردچوارەمیان پاکەتی توڕدا، ئەویشم هەلّگرتەوە.ئیدی ئەمانە هەر چوار پاکەتەکەن.تێگەیشتن؟ئەم پاکەتە جگەرانە دەردی ئێمەن. خەبەریان ناردووە ئەمسالّیش دێنەوە دەردمان دەرمان بکەن . ئێمەیش چاوەڕوانین، ها هاتن ، ها وادێن.

دەستم دایە پاکەتێك،شەش جاران لە سەری نووسراوە شوکران،شوکران. جارێکیش شوك ولەتەکیەوە وێنەی سیٚ ئەستێرەو رەسمی قایەغێك و وێنەی زەلامێکی سەرزل.

پاکەتێکی دیکەم دەست دایە، ئەم نووسین و تێبییانەی لەسەر نووسرابوو:

تکا بوٚ برادەری کوڕی خەزوورم لای وافی بەگ بکەم.دەگەڵ ەستەیەك دەچنە ئیتالّیا،ئەگەرنا ئیستیقالّە دەدا پێنج جارانیش نووسراو راقیسە.وێنەی هەشت دلّیش کێشراوە.

دیقەتی پاکەتێکی دیکەم دا، وێنەیەکی گەورەی چاوو وێنەیەکی زاری تاوڵە کراوە.لەتەکیانەوە نووسراوە: دەبیٚ، باشە،دەبیٚ، دەبیٚ، دەبیٚ،باشە. پێنج پیتی جیا جیاش نووسراوە.

- واهاتن

- واهاتن.

بووە غەلبەغەلب.لەبەردەم چایخانەدا سیٚ کەس لە ئوٚتوٚمبیل دابەزین.دێهاتییەکان چوٚن هەوەلّ بە ئێمە پێکەنین، ئێستا وا بەئەوان پێدەکەنن .یەکێکیان گوتی:

- مەرحەبا ئاغاکانم.

ئەوی تر:

- سەلامەلەیکوم هاولاّتیان.

سێهەمیان گوتی:

مەرحەبا برادەرینە.

لای رەشید ئاغا دووانیان لەسەر کورسی دانیشتن و یەکێکیان لە بان تەختە.بەدەستە راستیان مەرحەبایان لە گەورەو بچووکی چایخانە دەکرد.قەڵەوەکەیان گوتی:

- لەگەڵ پێرار ساڵدا چۆنن؟

لەجیاتی هەمووان رەشید ئاغا وەڵامی دایەوە:

- سەلامەت بن، ئێوە چۆنن؟

- ئێمە زۆر باشین بەتایبەتی کە ئێوە وا کەیفسازو خۆش گوزەران دەبینین.ماشەڵڵا گڤەتان دێ.

هەرە پیرەکەیان گوتی:

- براینە ، دیمۆکراسی مانای ئەوەیە گوێ لە خەڵك بگیرێ.

پاکەتی جگەرەی دەرهێنا.چاپچی بە ماشەی دەستی جگەرەی بۆ داگیرساند.درێژەی دایێ:

- ئێمە هاتووین لە ئێوەوە فێر بین و گوێ لە گرفتتان بگرین. شەرم مەکەن هەرچی دەردە، هەرچی داواکاری یە ،بیڵێن .

دێهاتییەك گوتی:

- یەکەمجار ئەم کۆبوونەوەیە کۆبوونەوەی گەلە.دەبێ بەهەند هەڵبگیرێ و جێ بەجێ بکرێ.

هەر سێکیان هەندێ شتیان لە سەر پاکەتە جگەرە نووسی.رەشید ئاغا سەری بەسەر نووسینی یەکێکیان داگرت و گوتی:

-گەورەم بەندە حەددم نیە، بەڵام وابزانم هەڵەت نووسی.

ئەوەی دیکە خەتێکی وەسەر نووسینەکەی خۆی داهێناو بە پەلە شتێکی دیکەی نووسی.

کابرای رەشید ئاغا ئاخاوتی گوتی:

- بۆ هەڵەیە؟ مەحزەری کۆبوونەوەیە.

- هیچ .بەمن وابوو هەڵەیە..

پاش ئەم قسەیە رەشید ئاغا لەسەرخۆ دەسماڵی کردەوەو هەر چوار پاکەتە جگەرەی دەرهێنان گوتی:

- پێرار، لەباسی کۆبوونەوە ئەم خەتخەتۆکانت کردبوون.

خەڵکەکە تێکڕا دایانە قاقای پێکەنین.ئەوانیش پێکەنین.

دێهاتییەك گوتی:

- مەکتەبمان دەوێ. پێنج پۆل بەش ناکات.

یەك لە سێ کەسەکان شتێکی نووسی و گوتی:

-نەخێر بەش ناکات.

رەشید ئاغا بە کابرای گوت:

- قوربان هەڵەت کرد(پاکەتی پێراری لەبەردەم دانا)پێرار بەرامبەر داواکاری قوتابخانە نووسیوتە شوکران، شوکران

ئیدی هەر یەکەو بە پەلە پاکەتی نایەوە گیرفان.رەشید ئاغا گوتی :

-هەمووی لێرەدا نووسراوە. تەماشا.. ئەم خەتخەتۆکانە داواکاری ئاوە، ئەم هەشت وێنەی دڵە بێ ئیشوکارییە.

پاکەتێکی بۆ درێژکردن:

-ئەمەیش پاکەتی ئەو زاتەیە کە ئەمساڵ لە گەڵتاندا نەهاتووە .

کابرای قەڵەو بە توورەیی یەوە گوتی:

- ئەمانە چنە؟

- هیچ.دەبێ چبن؟ دەردن دەرد..دەردی ئێمەن، هی ئێوەنە ؟ نازانم.

هەڵسانە سەرپێ بڕۆن. رەشید ئاغا گوتی:

-ئیشەکەی شوکرانت لەبیر نەچێ، سێ هەزاری تێدایە.

ئەوان سواری ئۆتۆمبیل بوون، ئێمەیش لە تەك رەشید ئاغا وەستاوین، یەکێکیان پرساری لەبرادەرانی کرد:

- خۆ پاکەتتان فڕە نەداوە؟

- نەخێر.

- فڕەی مەدەن هەڵیان دەگرێتەوە.

ئۆتۆمبیل رۆیشت . دێهاتییەکانیش دەستیان لەنێو پژدێنیان ناوەو پێدەکەنن.

# بابزانین چی لیٚ دیٚ؟

له بوغـازی دەریـای رەش، نزیـك لایـەنی ئەنادۆلـەوە، چـایخانەیەك هەیـە. زۆربـەی ئەوانـەی هاتووچووی دەکەن و لێی دادەنیشن یەکتر دەناسن و زۆربەشیان خانەنشینن.
ئەو بەیانیەش وەکو هەمموو رۆژەکانی دیکە باس لە کێشەو گـرفتی ناومـالْ و وەزعـی وولاٚت دەکرا.باس لە نرخ دەکرا کە حکوومەت وادەی دابوو لەسەدا سی دابەزێنیٚ باشـە چـی لیٚ دیٚ؟ کرێکارمان رەوانەی ئەلـەمانیاو ئوسـتورالیا کـردن ،هـەر تێـر نەبووین.ئێسـتایش وا کرێکـار رەوانەی یەکێتی سۆڤیەت دەکەن. ئەوەندە بەهەڕمێنە، کرێکار خەریکن بۆ نێو نووسین یـەکتری پان دەکەنەوە.هەلْلا هەلْلا..کورە ئەوە کرێکار رەوانەی ولاٚتی کۆمۆنیستان دەکەن؟برادەر پـارە پارەیە، لە کۆمۆنیستانەوە بیٚ لە فاشیزمانەوە بیٚ.بابیٚ. لە کوێیەوە دیٚ با بیٚ. من بـە پـارەی کۆمۆنیستان مزگەوت دروست دەکەم پۆلی قورئان خوێندن دادەمـزرێنم، هـیچ گونـاهیش نیـە بەلْکو خێریشمان دەگاتیٚ.
باشە ئەنجامی ئەم کارە بەچ دەگا؟ خوا بە خێری بگێڕیٚ.
گەورەم واریداتی سالاٚنەی وولاٚت بەشی دانەوەی زێدەبایی قـەرزەکانی ئـەمریکا ناکـا.بلْی ئـەو قەرزانەی ئەمریکا دەمانداتیٚ زێدەباییشی دێتـە سـەر؟ هـەلْلا هـەلْلا.. ئـاخۆ ئـەنجامی ئـەم مەسەلەیە بە چ دەگا؟
هەرچی کارخانەی لەم وولاٚتەدا دروست بکریٚ، رێگـەوبان، بەنـدەرگا. دەبـیٚ ئـەمریکا بڕیـاری لەسەر بدا.نەبابە. من ئەمەم نەدەزانی.باشە ئەنجامی ئەم وەزعە چۆن دەبیٚ؟
هەموو رۆژیٚ، هەموو ئێوارەیەك، تێکڕا ئەم باسەیان دەکرد. لـە هـەموو باسێکیشـدا هـەمان قسەیان دووبارە دەکردەوە..نە بابە..هەلْلا هەلْلا.
خانەنشینەکانی هامشۆی چایخانە دەکەن، هەمان پرسیاریان لە یەکتر دەکرد:
- باشە چی لیٚ دیٚ؟بابزانین چۆن دەبیٚ؟
-دەبیٚ ئەنجامی چ بیٚ؟
-ئەنجامی ئەم مەسەلەیە بە کویٚ دەگا ؟ بوەستە بزانین چی لێوە دیٚ؟

ئەو بە یانیەش لە چایخانەدا هەر هەمان باس و خواس بوو.یەکێ بەیەکێکی دەگوت( بابزانین چی لێوە دێ)؟
کرێکارێکی خانەنشینی دنیا دیدە، دەرچووی پەیمانگەی تۆپخانەی سەربازی گوتی:
- بوەستە با بزانین چی لێوەدێ ی ئێوە ، وەکو ئەو مەسەلەیە کە بەسەر خزمێکی من هاتووە.
خەڵکەکە مەرەقیان کرد دەبێ ئەو خزمەی ئەو چی بەسەر هاتبێ ؟ کابرای خانەنشین وای گێڕایەوە:
حکوومەتەکەی خۆمان دەستی بە فرۆشتنی زەوی و گردەکان کرد. کام هەواری جوان و دڵڕفینی بوغاز هەیە فرۆشتنیە دەوڵەمەندە عەرەبەکانی خاوەن نەوت.ئەو کاتە دەوڵەمەندێکی عەرەب پەیدا بوو. شیخ بوو، میر بوو ، هەردووکیان بوو؟ ناوی ئەبول فاتیك ئەلموشکی بوو.لە گردەکانی دەڕوانێتە بوغازو چاو لە دیمەنی دڵڕفێنی تێر نابێ بیناو ساختمانی دروست کرد. ئەمجارە کەوتە هەوای ئەوەی کچە تورکێك بێنێ. کام کچە تورك، لای گرنگ نیە بەڵام بەمەرجێ جوان بێ.
هەرئەو دەلالانەی زەوی یان بۆ ئەبول فاتیك دۆزیەوە، کەوتنە دووای کچ دۆزینەوە.ئەبول فاتیك چەند مەرجێکی هەیە: تەمەنی بچووك بێ،جوان بێ،دڵساف و بێ فرت وفێڵ بێ،کچی کوڕی کچ بێ، دەستی بە دەستی پیاو نەکەوتبێ. لەم زەمانەدا دۆزینەوەی کچی وا ئاسانە؟ ئەبول فاتیك پارەی زۆرە و مەحتەڵ نابێ. دەلال کەوتنە خۆیان. ئەبول فاتیکیش لەملاو لەولا خەریك بوو خۆی فێری زمانی تورکی دەکردو چەند وشەیەك فێربوو:بخەوە،هەڵسە،درێژبە،وەرگەڕێ و هەندێکی دیکەیش کە پێویستیی ئەو جێ بە جێ دەکەن.
زۆریان کچ نیشانی ئەبولفاتیك دا، عەرەبی کوڕی عەرەب بە هەموو کچێك رازی نابێ! دەمو چاو روون وەك شیری سپی، بەدەن لەحم بەعەجین، نێو قەد باریك.
دوواجار ئەبولفاتیك کچێکی بەدڵ بوو.ئیدی ئەوکات ئێمە ئەبولفاتیکمان ناسی ،چونکە ئەو کچەی داخوازی دەکرد خزمێکی دووری ژنەکەی من بوو. کچە تەواو ئەو کچە بوو ئەبول فاتیك گەرەکیەتی: تەمەن حەڤدە ساڵ، کۆرسێکیش دەرسی ئایینی خوێندووە، سپی، باریك. لەدڵسافیانیش هەر گیل دێتە بەرچاو.ئەبولفاتیکیش ببینن هەر لە دەعبا دەکا. باوکی کچەیش کابرایەکی پیرە بە گشتی خێزانێکی هەژارن و رازی بوون بەو پارەیەی ئەبول فاتیك بۆی ژماردن. کابرا لەبەر ئەوەی ژنی دیکەی هەیە، کچەی بە مەلا مارەکردو گوازتیەوە.
کچە بەوئاهەنگە گەورەو تێرەی ئەبول فاتیك لە کاتی گوازتنەی سازدا زۆر کەیف خۆش

بوو.خزم و ئەقرەبای کچە بە ئەبولفاتیکیان دەگوت فاتیك بەگ، تەنیا برایەکی کچە نـەبێ کـە شەش ساڵ لەخۆی بچووکتر بوو، بە پێچەوانەی ئەو هەر لە شێتانی دەکرد، پێی دەگوت مامـە فاتیك.. مامە فاتیك وا رۆیشت مامە وا هات.

من و ژنم دووجاران سەردانمان کردن، کـاتی نیشـان کـردن و دووای گوازتنەوە.لـەو ماڵـەی وا لەسەر گردەکانی بوغاز بوو.

زەمان هات ، زەمان رۆیشت.. ئیدی من رووداوەکانی دیکەم لە دەمی ژنم بیست: ئـەبولفاتیك شەوی یەکەم تێدەگا بووك ژنە، چونکە هەر بە دڵسافی خۆی هەموو شتێکی تێدەگەینێ.

ژنە پچکوولانەی ئەبولفاتیك بە عەباوە دەچێتە کۆڵان. مامە فاتیکیش چـونکە پیـاوێکی بـەد گومان و دڵ پیسە،پێی خز م کەسـی ژنـە لـە ماڵەکـەی خـۆی دەبـڕێ و نایـەڵی هاتووچـووی بکەن.باشە بەڵام ئەو کاتانەی ئەبولفاتیك لەماڵ نابێ کچە بێزار دەبێ. مامە فاتیکیش نایەوێ کچە لە ماڵەوە حەپس بێ. لەو ماوەیەدا ئیشی کڕین و فرۆشتنی دەبێ و دووسـێ رۆژان دەبـێ لـە مـاڵ دوور بکەوێتـەوە. بۆیـە مـاوەی ژنـەدەدا ئەگـەر بچـێتە دەرەوەو لـە کووچـە دوور نەکەوێتەوە. ژنە پێی خۆشە بـەڵام بەتـەنیا لـە کـوڵان چ بکـا ؟داوای روخسـەت دەکـا بچـێتە سینەما.مام فاتیك زۆر بیری لێدەکاتەوە. بڕیاردان ئاسان نیە..ئەگەر بڵـێ مـەڕۆ رەنگـە زویـر بێ،بلێ بڕۆ رەنگە تاقی تەنیا تووشی بەلایەك بێ.دەڵێ:

-باشە روخسەتت دەدەم.. بەلام با هەوەڵ خۆم فلیمەکان ببینم.

مام فاتیك تەماشای تەواوی فلیمەکان دەکا، تا دەگاتەفلیمێکی ترکی کە باس لـە (عەداڵـەتی حەزرەتی عومەر )دەکاو ئەو فیلمەی بۆ دەست نیشان کرد.

تازە بووك کە (نەجمیە)ی ناوبوو، دەچێتە سینەماو مامە فـاتیکیش بـەرەو ئیشـوکاری خـۆی.

رۆژی دوواتر کە دەگەڕێتەوە (زۆر شوکر) دەبینی نەجمیە وا لە ماڵەوەیە:

- نەجمیە؟

- قوربان.

-کە من لێرە نەبووم چت دەکرد چت نەکرد؟

نەجمیە دەست پێ دەکا:

- هەر مەپرسە

چۆن نەپرسێ؟ لە مەراقان خەریکە دەتەقێ.

- چ بووە نەجمیە؟

- شتێکی وام بە سەرهات ، زۆر سەرسام بووم!
-چیت بە سەرهاتووە؟
نەجمیە بی کەموزیاد بۆی دەگێڕێتەوە:
- عەبام لەخۆم لوولداو چوومە ئەو سینەمایەی تۆ گوتت.
-زۆر جوانە
- چوومە کووچە
-ئیێ؟
-بەڕیگەدا دەرۆیشتم کابرایەکم لێ نزیك کەوتەوە
- کابرایەك؟
-بەڵێ.. من دەڕۆم ئەویش دەڕوا.. مەراق گرتمی گوتم با بزانم چی لێوە دێ؟
مام فاتیك تێکدەچێ، بەڵام ژنە ئەوەندە دڵسافانە رووداودەگێڕێتەوە کە دان بە خۆیەوە بگرێ! دەڵێ:
-وەڵاهی منیش مەراقم کرد ، بابزانین چی لێوە دێ
- من دەڕۆم ئەویش دەڕوا.. خۆی بە منەوە نووساندوە.. لە دڵی خۆمدا دەمگوت بابزانم چ دەبێ.
- یا سوبحانەڵا.. بازانین چ دەبێ!
- پلیتی ئەو سینەمایە دەکڕم کە تۆ گوتت، ئەویش پلیت دەکڕێ. چوومە ژوورەوە،بۆ ئەویش نەهات؟
ئەمجارە مام فاتیك پێشی کەوت و گوتی:
-وای عەجایەب.. بابزانین چی لێوە دێ ؟
-پاشان لەسەر کورسی یەك دانیشتم ئەویش هات لە سەر کورسی یەکەی تەکم دانیشت.
-سەیرە! بابزانین چی لێوە دێ؟
-گلۆپ کوژانەوەو فلیم دەستی پێکرد.
-ئیێ؟ نەجمیە تێم بگەینە.
-کابرا دەستی نایە باخەڵم
- ئەوە چ دەڵێی؟ عەجایەب!
- دەستی لە ژێر عەبام نا، منیش زۆر سەرسام بووم

- چی دەکرد؟
- نازانم . منیش مەراقی ئەوەبووم، دەبێ چبکا؟چاوەڕوان بووم بزانم چی لێوە دێ؟
-وەڵاهی منیش مەراقم کرد، بابزانی چ لێوەدێ؟
- پاشان کابرا دەستی بەولاو ئەملامی دەهێناو دەیگرت، چ دەکا نازانم؟توخوا تۆش بی مەراق ناکەی؟
ئاگر لە نێوچەوانی مام فاتیك دەباری، بەڵام ژنە ئەوەندە دڵسافانە بۆی دەگێڕایەوە، مەپرسە!
- نەجمیە با بزانین چی لێوە دێ؟
- پاشان (عەدالەتی حەزرەتی عومەر) تەواو، گڵۆپ داگیرسان.. هەڵسامە سەرپێ، بۆ ئەویش هەڵنەستا؟
- ئەویش هەڵسا؟
- ئا بەڵێ.
- عەجیب و غەریب.. ئێ دووایی؟
- لە سینەما هاتمە دەرەوە، ئەویش هاتە دەرەوە. من بە ڕێگەوە دەڕۆم، ئەویش لە تەکمەوە دەڕوا.
- کچی نەجمیە وەڵاهی زۆرم مەرەقمە بزانم چی لێوە دی؟
-منیش وەکو تۆ، مەرەق بووم. بامدایەوە کووچە
-کابرایش هات؟
- هات.
-زووکە نەجمیە تێمبگەینە زۆرم مەراقە.
-لە دەرگای ئاپارتمانی خۆمان وەژوور کەوتم، کابرایش بەژوور کەوت.مەراقم کرد دەمگوت بوەستە بزانە چی لێوە دێ؟
مامە فاتیك ئارەقەی کردووە:
-پاشان؟
-بۆ نهۆمی خۆمان وەسەرکەوتم، کابرایش وەسەرکەوت.
-ئای کابرا، وای کابرا
- لە جانتای دەستمەوە کلیلی دەرگایماڵەوەم دەرهێناو چوومە ژوورەوە، ئەویش هاتە ژوورەوە.
-کابرایش لە ژوورەوەیە؟

- ئا بەڵێ.
-ئەمان نەجمیە زووکە تێمبگەینە.
-چوومە ژووری نوستن جلّ وبەرگم دابکەنم، ئەویش هات و جلّی خۆی داکەند.
-کچێ نەجمیە ئەوە تۆ چ دەلێی؟
-وەلاهی چۆنت بۆ باس دەکەم وایە. خۆم کوتایە ژێر لێفە، ئەویش خۆی کوتایە ژێر لێفە.
مام فاتیك وەك ئاسنی سوورکراوە ئاگری لی دەباری:
-هەی هاوار! راوەستە بزانین چی لێوە دێ؟
-منیش مەراقی ئەوەبووم لە ناو جێگەدا چ دەبێ؟
-نەجمیە زووکە بلّی،زۆرم مەراقە بزانم چ بوو
- کورە هیچی وا نەبوو لە خۆمەوە ئەو هەموو مەراقم بوو.
مام فاتیك گۆڵم گۆڵم ئارەقە دەسڕێتەوە:
-باشە چ بوو ؟ چی کرد؟
- عەینی ئەو شتەی تۆ هەموو شەوان دەیکەی.!!!
باشە مامە فاتیك چ بکا ؟ شلم بلم وەرگەڕێتە سەری؟ وەدەری بنێ ؟ ژەنەی کلّۆڵ و دلّساف ئەم بەلایەی بەسەر هاتووەو بە خۆی نازانێ! دوواجار بڕیاری دا پێ لە عەیبە بخشێنێ و چاوپۆشی لێوە بکا. گوتی:
-کچێ نەجمیە منیش بیرم بۆ شتی دیکە دەڕۆیی و مەراق بووم بزانم چ دەکا. کەچی هیچی وا گرنگ نەبوو!
کابرای کریکاری تەقاویت گوتی:
-ئیدی ئاوا برادەرینە،حالّی ئێمەش وەکو حالّی ئەو ژنە وایە..
لە گۆشەی چایخانەدا کابرایەك قسەکەی هەلّقۆستەوە:
-دەتەوێ چمان تێ بگەیێنی؟
-ئێوە رۆژ نیە نەلّێن با بزانین ئەم وەزعە چی لێوە دێ. منیش ئەنجامەکەم پێگوتن کە بەلّێ بەدەردی ژەنە دەچین.
درایە قاقای پێکەنین. کابرا گوتی:
- بەلاّم گرنگ نیە!

# باریکەی باریکەلە

لە ماڵ ،لە ژێر مێزێکدا دەفتەرێکی گیرفانم دۆزیەوە.پرسیارم لە هەرکێ کرد کەس بەخاوەنی دەرنەچوو. بەرگێکی شینی جوان و بە ئەستێرە رازاوە ..ویستم بزانم هی کێیە لاپەڕەم هەڵدانەوەوهەر لەیەکەم لاپەڕەدا سەرسام بووم. ناوی پیاوێکی زۆر گەورەی ئەم مەملەکەتە بە خەتێکی درشت نووسراوە. لاپەڕەی دووەمم هەڵدایەوە ئەویش ناوی پیاوێکی گەورەی لێ نووسراوە. چەندلاپەڕەیەکی دیکەو هەریەکە ناوی چەند کەسێکی ماقووڵ لە گەڵ ژمارەی تەلەفۆن و ئەدرەسی ماڵ. ئەم کابرایە ئەم هەموو خەڵکە دەناسێ! هەمووشیان کاربەدەست لە سیاسی و ئیداری ،هەرە بچووکەکەیان بەڕێوەبەری گشتییە.ئەوەی تێبینیشم کرد هەموویان ئەو کەسانن کە ئێستاکی لەسەر حوکمن.

هەرکەسێکی دیکە بێ لە شوێنی من دەپەشۆکێ وسەرسام دەبێ. ئاخر ئەم هەموو ناوونەدرەسی پیاوی گەورە بۆ من وەکو بۆمبایەك بوو تەقیەوە.ئەم دەفتەرە بە نیازی پاك دانەنراوەو هەبێ و نەبێ دوژمنێکم بەنهێنی دایناوە. ترسم لێ نیشت، بەڵکو ئێستا دەرگا لێدراو پۆلیسی نهێنی ڕژانە ماڵەوەو گوتیان:

- دەفتەر دەربێنە

منیش دە لێم:

- دەفتەری چی؟

پاشان ئەملاوئەلا دەپشکنن و دەفتەر لەژێر مێزەوە دەردەهێنن.ئەمەم باش دەزانی و ئەونامەردەی ئەم دەفتەرەی داناوە هەر کێ بێت خەبەری پۆلیسیشی لێ داوم.پاشان پولیس دەفتەر دەدۆزنەوە دەڵێن:

-بڵێ بزانین هەرچی پیاوی گەورەیە لەم مەملەکەتەدا تۆ ناوئەدرەس و تەلەفۆنت نووسیون، تومارییان بۆ رێك دەخەی؟ ئیزعاجیان دەکەی؟یا نیازت وایە تیرۆریان بکەی؟

خوایە من چ وەڵام بدەمەوە؟ چ بڵێم تا باوەڕم پێ بکەن؟ چ ئاڵچاغێکە ئەم داوەی داناوەتەوە؟ ئێوارە سێ دۆستم لابوون و ئەمانەیش شتی واناکەن یەکیان مامۆستای زانکۆیەو درس

دەڵێتەوە و دوومیان فەرمانبەرە و ئەوی دیکە ئەدیب و نووسەرە ودۆستی گیانی بەگیانی و هاوڕێی بیست ساڵەمە.

رۆژی دوواتر هەمان مامۆستا هاتەوە سەردانم، ناڕەحەتی لە دەم و چاوی بەدی دەکرا.کەچی ئەو رووی لە من کردو گوتی :

-خێرە وا پەشۆکاوی؟

گوتم:

- ئەی تۆ چیتە؟

گوتی:

- بۆخاتری خوا دوێنی شەودەفتەرێکم لێ جێ نەماوە؟

دەفتەرم دەرهێنا:

- ئەمەیە؟

دفتەری لە دەست دەرهێنام :

- خۆیەتی ..کورە لە دوێنیوە حەجمانم لەبەر بڕاوە.

دەستم گرت و بەرەو ژوورەکەی خۆمم برد:

- ئەی من نالێی چەند ترساوم. بەڕاست تۆ ئەدرەسی ئەم هە موو پیاوە زل و ماقولانەت بۆ نووسیوە؟

کابرا پەشۆکا.گوتی:

- بۆچی تۆ ئەدرەسی ئەم پیاوانەت لە دەفتەری گیرفان تۆمار نەکردووە؟

- نەخێر

گوتی:

- پیاوی چاکبە بۆخۆت دەفتەرێك رێك بخەو بیخەرە گیرفانتەوە. جا با بۆت باس بکەم بۆ ئەم ناوانەم لەم دەفتەرەدا نووسیون؟

لەم دووابییەدا مەرەقم کەوتە سەر کۆکردنەوەی قەڵەمی پاندان. جاروبار دەمکڕین و زۆرجاریش بەدیاریی بۆم دەهاتن و هەمیشە دەپازدە قەڵەم پاندانم لەگیرفاندابوون .دۆستێکی شاعیری ئەڵمانی هاتە ئێرەو لەهۆتێل سەردانم کرد، دەیزانی قەڵەمی مەرەکەف کۆدەکەمەوە ، قەڵەمێکی بەدیاری دامێ.هەر لە هۆتێل هاتمە دەرەوە لە سووچێك وەستام و روانیمە قەڵەم بینیم نوکەکەی کەمێ درشتە، دەفتەری گیرفانم دەرهێناو قەڵەمم تاقیکردەوەو دوو وشم

بەخەیاڵدا هـات و نووسـیمن (باریکـەی باریکەلـە). بەپارچـە کاغـەزە سمپـارە دەسـتم کـردە باریککردنی نووك، کەلە ناکاو هەردوو مەچەکیان گرتم:

- ئەمە چ دەکەی؟

- من؟ هیچ، قەڵەم تاقی دەکەمەوە.

- ها! قەڵەم! تۆچکارەی؟

- لە زانکۆ..

یەکێکیان نەیهێشت قسەم تەواو بکەم ،گوتی:

- پرۆفیسۆری؟ وای پرۆفیسۆر وای..

ئەمەی گوت و مستێکی خێواندمێ وقۆڵی چەپمی گرت ،ئەوەی دیکە قۆڵی راست و گوتیان:

-پێشمان کەوە

گوتم:

- برادەرینە ئێوە بەهەڵەدا چووینە

- بڕۆ..

بردمیانە پۆلیسخانەیەك و لە ژوورێکیان پەستام. بینیم کەس بەلامەوە نایە.نازانم پاشان چۆن یەکێك هات و گوتی:

لەسەرچۆك دانیشە

گوتم :

- نەخێر رادەوەستم

- چۆك نادەیتەوە ها پرۆفیسۆر!دەی زووکە چت لە گیرفاندایە دەریانبهێنە.

شـتەکانم دەرهێناولەسـەر مێـزم دانان.چـواردە قەڵـەمی پانـدان،دوو دانـە کتێب،دەفتـەرێکی تەلەفۆن،نووکە قەڵەمێك،دووپارچە کاغەزی سمپارە.

دەستی بۆقەڵەمەکان درێژ کرد:

- ئەمانە چنە؟

- قەڵەمن

- قەڵەمن ها؟ وای پرۆفیسۆر،های پرۆفیسۆر

سێ کەسی دیکەیش هاتن و تێکڕا کەوتنە پشکنینی شتەکان. یەکێك پارچە کاغەزی سمپـارەی دەست دایەو گوتی:

- ئەی ئەمە چیە؟

- کاغەزی سمپارەیە.

ئەمە چۆن سمپارەیەکە؟ لووس و بێگەرد..کێی پی دەسمی؟

- سمپارەی وردە، هی زێڕینگەرانە

- ها..ها.. سمپارەی ورد.وای پرۆفیسۆر، های پرۆفیسۆر..

ئەمەی گوت و مستێکی خێواندە قەپرغەم. بینیم نەخێر ئیش ئالۆز دەبێ.گوتم:

- برادەرینە، هەڵەیەك لەم مەسەلەیەدا هەیە. من نازانم ئێوە بۆ منتان هێناوەتە ئێرە، بەڵام من لە زانکۆ ناسراوم و دەرس دەڵێمەوە.

یەکێکیان لەبان مێزەکە دانیشت و قەڵەم و کاغەزی دەرهێنا، مەحزەر بنووسێ. ترسم لێ نیشت.. باریکەی باریکەلە جەفرەی تۆڕێکی سیخوڕییە؟ چواردە قەڵەمی پاندان، دەفتەری گیرفان، نووکە قەڵەم ،دوو کتێب، کاغەز سمپارەی زێڕینگەران،باریکەی باریکەلە.. هەرکێ بێ گومان دەکا.نەمدەزانی چ بکەم.ئەمانە هەمووی لە مەحزەر بنووسرێن گرفتێکە ئەمما گرفت.دەمتوانی هەریەکەو هۆیەکی بۆ بدۆزمەوە، تەنیا ئەو باریکەی باریکەلە نەبێ. ئەم بەلایە چبوو بەسەری خۆم هێنا؟بۆ شتی دیکەم نەنووسی؟

یەکێکیان مەشغوولی هەڵدانەوەی لاپەڕەکانی دەفتەرە بچکۆلانەکەی گیرفانم بوو،لاپەڕەیەکی هەڵدایەوە، کەمێ گرژیەوەو بە هەواڵەکەی دیکەی نیشان دا و چرپە چرپێکیان کردو یەکسەر گۆڕاو گوتی:

- جەنابی مامۆستا،ئەم ناوەی وا لێرەدا نووسراوە چی جەنابتانە؟

بەتەواوی دەنگی گۆڕابوو..گوتم:

- رەفیقە پۆلی قوتابخانەیە.دوێنێ دەعوەتی ئەوبووم ،ئەدرەس و ژمارەی تەلەفۆنی خۆی دامێ. راستییەکەی چەند ساڵێك دەبوو ئەم برادەرەم نەدیبوو نەمدەزانی بۆتە بەڕێوەبەری گشتی!

پۆلیس دەستی دەلەرزی و بەشەرمەوە گوتی:

-وا..دیارە بەڕێوەبەری گشتی برادەرێکی زۆر نزیکتانە ؟

-ئا بەڵێ، لە قوتابخانە پێمان دەگوت رەزا گەڵحۆ

- خۆشحاڵ بووم بەناسینت مامۆستا، ئەوە بۆ دانانیشی؟ دەفەرموو تکا دەکەم.

رووی کردە برادەرەکەی دیکەی و گوتی:

-کاکە مامۆستاتان بۆ هێناوە؟-رووی لەمن کرد-فەرموو مامۆستا...

منی برده ژوورێکی رێکوپێك و لەسەر قەنەفەیەك دانیشتم . یەکیان گوتی:
-ئەمڕۆ دنیاش گەرمە، ساردێك نانۆشی؟
-ئەستەغفروڵا
ساردیان هێنا، من و یەکێکیان بەتەنیا لە ژوورەوە ماینەوە ئەوانی دیکە چوونە دەرەوە.پاشان رووی تێکردم و گوتی:
- مامۆستا هەروا هاتبوون؟ هیچ ئەمرێکتان هەبوو؟
ترحێو! ئەمری چی؟ ئەی ئەمانە قۆڵیان نەگرتم وبەزۆر نەیانهێنامە ئێرە؟ بینیم وەزعەکە لە بارەو تا تێك نەچووە با بۆی دەربچم .. گوتم:
- نەخێر هیچی وا نەبوو، هەربۆ ئەحواڵپرسین بوو..
- ئۆی مامۆستا زۆر بەخێربێن گەورەت کردین.
گوتم :
- بەیارمەتی جەنابت من دەڕۆم..
هەڵسایە سەرپی و تا دەرگەی دەرەوە بە ڕێی کردم ،چونکە خوا خوام بوو لەدەستیان رزگارbم، بە عەیبم زانی داوای قەڵەم و کتێب و نووك بکەم. گوێم لێ بوو یەکێك بانگم دەکا:
- مامۆستا، مامۆستا،پرۆفیسۆر، ئەم شتانەت لەبیر کرد
قەڵەم و کتێب و دەفتەرو کاغەز سمپارەی دامێ و پرسی:
- مامۆستا بەڕاست بەڕێوەبەری گشتی برادەرتە؟
گوتم :
- بەڵێ برادەرمە، بۆ دەپرسی؟
گوتی:
- چوزانم ،بۆتە مۆدە هەریەکێکی دەیگری ناوی کۆمەڵێك پیاوی ماقوڵی ئەم وولاتەی لە دەفتەری گیرفان نووسیوە.بەڵام دیارە دۆستەکەی تۆ زۆر نزیکە وانیە؟
- بەڵی برادەێکی زۆر نزیکە.
- لەم پارچە کاغەزە دا کونیەی خۆم نووسیوە ،مەمنوون دەبم بیدەیتە جەنابی بەڕێوەبەری گشتی.
مامۆستا خالید دووای ئەوەی رووداوی گێڕایەوە گوتی:
-ئیدی لەو رۆژەوە، لێرەو لەوێ ،لە هەر شوێنێك ناوو ژمارەی تەلەفۆنی بەرپرسێکی زلم چنگ کەوێ لەم دەفتەرەدا یاداشتیان دەکەم.دوێنێش کە دەفتەرم ونکرد گەلێ نارەحەت بووم . برا

ئەم دەفتەرە زامنی ژیانە. کاکە تۆش دەفتەرێکت هەبێ باشە.بەڵام لەمنەوە نەسیحەت ، ئەوانەی تەقاویت دەبن یا لەکار لادەبردرێن یا بەهۆی نەخۆشیەوە لەسەر کار لادەچن، زوو ناوەکانیان لەدەفتەر رەش بکەرەوە ئەگینا دەبنە دەردو بەلا.. بڵێ دەفتەری وات نیە؟

- نەخێر

- کاکە دروستی بکە.ئێستاکێ بۆ ئەوەی لەقەزاو بەلای دنیا دووربن هەرکەسەو دەفتەرێکی وای لەگیرفاندایە. پیاو لەم دەرگایە بچێتە دەرەوە چی بەسەردێ ؟ مەعلووم نیە.لە کۆنەوە خەڵك نوشتەو دوعایان بەرگ دەکرد ئێستا لە جیاتی نوشتە دەفتەر هەڵدەگرن و سەداسەد کاری خۆی دەکا.

# چۆن بەسێ ڕۆژان فێری ئینگلیزی دەبی؟

لەم ڕۆژکارەدا لەهەندێ گوندی بچووکی تورکیایشدا یەکدووانێك دەدۆزیتەوە ئینگلیزی بزانن ،ئەی زەمانی جاران چۆن بوو؟

لەتەواوی شارێکی زەبەلاحی وەکو ئیستانبووڵ ئەوانەی ئینگلیزییان دەزانی ژمارەیان لە پەنجەی دەست تێپەڕی نەدەکرد.چونکە کەس نەبوو خەڵکەکە فێربکا کەسانێکی زۆر خۆیان لەم زمانەوە بەدوور گرت.هەرچەندەی بڕیاریش درا لە فێرگەکاندا دەرسی ئینگلیزی بخوێندرێ، بەڵام پەیدا کردنی مامۆستا مەحاڵ بوو.

زۆرگەڕان، دووای چەند ساڵ ئەنجا پێشنوێژی مزگەوتی(ئەدیرنا قاپا)یەن دۆزیەوە، کە لە هیندستاندا فێری ئینگلیزی ببوو. مەلا لەجەنگی یەکەمی جیهانیدا لە فەلەستینەوە بە دیلی ڕەوانەی ئەوێ کرابوو.

مامۆستا لە قوتابخانەکەی ئێمەدا دەست بەکاربوو، بەندەیش لە یەکەم دەستەدا بووم زمانی ئینگلیزیمان خوێند.

لە ماڵەوە خۆم هەڵدەکێشا کە بەڵێ لە گەڵ مامۆستا بە ئینگلیزی دەدوێم و باوکی مسکێنم باوەڕی کردبوو، زۆریش کەیفی دەهات.

ئێوارەیەکیان دەگەڵ باوکم و چەند دۆستێکی ئەو بە سواری پاپۆر دڕۆیشتینە( هەیبەلی ).

لە بەرانبەرماندا کابرایەکی بێگانە دانیشتبوو، لەبەرە خۆیەوە پرتە پرتی بوو.

باوکم پرسیاری لێکردم:

-ئەم یارۆیە چ قەومێکە؟

وام خۆنیشاندا گوایا لە قسەکانی دەگەم، گوتم:

-ئینگلیزە..

-ئەی بۆ بە ئینگلیزی قسەی لەگەڵدا ناکەی؟

ئیدی باوکم و برادەرەکانی تێکر کردیانە هەڵلا:

-دەی قسەی لەگەڵ بکە.. ئا بەڵێ بیدوێنە..

کابرا لە ورتە ورتی خۆیەوە نەدەکەوت..
هەرچی فێری ببووم  لە مێشکی خۆمدا کۆمکردنەوەو یەکسەر بۆی چووم و گوێمنەدایە ئـەنجام و گوتم:
-وات ئیز یوور نێم؟
کابرا ورتەیەکی لێوەهات و هیچی لیّ حاڵی نەبووم. لەم حاڵەتـەدا خۆنـاکریّ بێـدەنگ بم، وەك ئەوەی کە بەڵیّ تێگەیشتووم، گوتم:
-مای نێم ئیز حەسەن.
کابرا لە دەنگی لەرزۆکییەوە دیاربوو توورە بـووە.ئـاخ خۆزگـە دەگەیشـتینە هەیبـەلی و ئـەم بەڵایەم لە کۆڵ دەبۆوە:!
-هاو ئار یو؟
دیقەتمدا یەکێك لای چەپ دانیشتووە وا پێدەکەنیّ.. ئای کە تێکـەوتم! بـەڵام دەکـریّ پاشـگەز ببمەوە؟ بە کابرام گوت:
-وات ئیس زیس؟
کابرا بەجاریّ توورە بوو، تەنانەت دەستەکانی دەجووڵاندنەوەو ورتەی لێوە دەهات:
گوتم:
-زیس ئیس مای بووك
کابرا قیژاندی و دەستی بۆ کاتژمێری برد. بەندەیش بۆ ئەوەی لـە خەڵکـە بگـەیێنم کـە بـەڵی زمانی بەڵەدم، لێی نزیککەوتمەوەو سەیری سەعاتی دەست کابرام کرد. پاشـان سـەرێکم بـادام گوتم:
نۆ، نۆ!!!
کابرای بەمن پێکەنی بۆ ئەوەی شـەرمەزارم نـەکا سـەری وەرگێـرا. یـارۆی بێگانـە جـارێکی دیکیش ئیشارەتی بۆ سەعاتی دەستی کردو هەندیّ ورتە ورتی کـرد کەحەشـتەبای لـیّ حـاڵی نەبووم. منیش وەکو ئەو قیژاندم:
- مای نەمبەر ئیز فۆرتی وان.
ئیدی هەردووکمان بە جووتە دەمانقیژاند:
-دو یو درینك ووتەر؟
یەکیّ لە دوستەکانی باوکم گوتی:

-ڕۆڵە ئەم کابرایە چ دەڵێ؟
نەخێر ریسوا بووم..جا ئێستا چی وەڵام بدەمەوە؟ دەی پێویست بە بیرکردنەوە ناکا..گوتم :
-لە پاپۆڕ تووڕەیە مامە..دەڵێ زۆرمان پێچوو، بڕوانە کاتژمێر ،لە پێنج و نیوەوە بەرێکوتووین کەچی هێشتا نەگەیشتووین..
ئەی تۆ چیت پێگوت؟
-گوتم تووڕە مەبە لەوانەیە کاتژمێری تۆ هەڵە بێ!!
کابرای پێدەکەنی خۆی بۆ انەگیراو دابەزییە نهۆمی ژێرەوەی پاپۆڕ، منیش بەردەوام قسەم لەگەڵ کابرای بێگانەدا دەکردو قسەکانم بۆ باوکم و برادەرەکانی وەردەگێرا .
کە لە هەیبەلی نزیك کەوتینەوەو خۆمان ئامادە دەکرد دابەزین، کابرای پێم پێدەکەنی لێم نزیکەوتەوەو گوتی:
-ئەم کابرایە ئینگلیز نیە..
چاوەڕوانی منی نەکرد بڵێم( دەزانم ئەمریکییە) گوتی:
-کابرا ئەڵمانە.بەڵام شێری بچکۆڵانە باشت تووڕە کرد..
ئەمە یەکەم کاری وەرگێرانم بوو. هی دووەمیش لەو باشتر نەبوو..
لەبیرمە پۆ لی دووەمی ناوەندی بووم. واتا ئینگلیزییەکەم باشتر بووە. باوکم بەو ئینگلیزی زانینی من گەلێ دڵخۆشبوو کەس نەمابوو بۆی باس نەکا.
هاوینێك خێزانێکی ئینگلیز هاتنە گەڕەکەکەی ئێمەو بەرانبەر ماڵێ ئێمە دانیشتن. باوکم سووربوو لەسەر ئەوەی دەبێ سەردانیان بکەین. گرفتی منیش لەوەدابوو کە ناتوانم بە باوکم بڵێم ئینگلیزییەکەم دووکەڵ دەکا، ئیدی هەر جارەی بە بەهانەیەك خۆم دەدزیەوە. بەڵام رۆژێکیان باوکم توند مەچەکی گرتم و بە جووتە چووینە ماڵی کابرای ئینگلیز. لە دەرگامان دا گیژۆڵەیەکی جحێڵ دەرگای کردەوەو بەسەرسوڕمانەوە دیقەتی ئێمەی دا لە دڵی خۆمدا گوتم: جا چی پێ بڵێم؟ باوکم گوتی:
- دەی تێی بگەیێنە، چیە ئینگلیزیت لەبیر چۆتەوە؟
گوتم:
- باوکە لەوانەیە کچە ئینگلیزی نەزانێ!
کەچی گیژۆڵە یەکسەر بە ئینگلیزی گوتی:
- چیتان دەوێ؟

تێیگەیشتم بەڵام چۆنی وەرام بدەمەوە؟باوکم زانی پەشۆکاوەم، بە کچەی گوت:

- کچم مسیۆ لەماڵە؟

ئیدی زمانم کرایەوەو گوتم:

- کوانێ مستەر؟

پێموایە کچە تێگەیشت و یەکسەر دەرگای کردەوە و فەرمووی لێکردین.

ئیدی خۆمـان رووبـەرووی کابرایـەکی لاوازی سـاردی ئینگلیـزی بینیـەوە، بەسەرسـوڕمانەوە تەماشایەکی کردین.باوکم گوتی:

- دەی رۆڵە بیدوێنە.

- چ بڵێم؟

- بڵێ ئێمە دراوسێتانین و هاتووینەتە سەردانتان.

سەرتاپا غەرقی ئارەقە بووم و ئەو چەند وشەیەی دەشمـزانین لـەبیرم کردن.کـابرای ئینگلیـزیش دیقەتی باوکمی دەداو هەندێ قسەی کردن فڕیان تێنەگەیشتم.

ئۆخەی وەبیرم هاتەوە..مامۆستای ئینگلیزی پێشنوێژی جـاران داوای لێکردبـووین چـیرۆکێکی منداڵان ئەزبەر بکەین. چیرۆك باسـی قارەمـانیی مشـکێك دەکـا . حیکایـەتێکی ئاسـانە و رستەکانی کورتن .. دەستم بە گێڕانەوەی کرد:

- مشکێکی بچکۆلانە هەبوو..

کابرا چاوەکانی زەقکردنەوە، بەڵام گوێمنەدایێ و بەردەوام بووم:

- مشك برسی بوو بەدووای خۆراك دەگەڕا..

کابرای ئینگلیز زیاتر سەرسام بوو، تاوێك دیقەتی منی دەداو تاوێك هی باوکم..

- مشك چووە ژوورێ ئازوقە ،بەڵام لە بەختی رەشییەوە پشیلەیەکی لێبوو.

باوکم هەرچەندەی هیچی لێ حاڵی نەدەبوو،بەڵام گەلێ کەیفساز بوو.

- پشێلە بازیدا مشك بگرێ، بەڵام مشکە بۆی دەرچوو پشیلە خۆی لـە شووشـەی مورەبـا داو شکاندی،پشیلە وەدووای کەوت ئەمجارە رۆن ڕژا..

کابرای ئینگلیز زەردە خەنەیەکی کرد..

- پشیلە ویستی مشك بگرێ بەڵام نەیتوانی..

کابرا (یەس)ێکی لەدەم هاتە دەر..

- پشیلە فەردەی ئاردی رژاند..

- یەس یەس
- مشك تێپەڕبوو..
- یەس
حیکایەت بەردەوام دەبێ.پشیلە بەدووای مشك کەوتووەو هەر جارەی بـۆ قوژبنێـك بـازدەداو شتێك دەڕژێنێ یا دەشکێنێ.دوواجار مشك لە کولانەیەکی تەسکەوە بۆی دەردەچێ.خاوەن ماڵ بەم حاڵە تووڕە دەبێ و دارکاریی پشیلەکەی دەکا.
کابرای ئینگلیز بە شڕە ئینگلیزییەکەی من پێدەکەنی . پاشان چای و کولیچەی داینێ.کە ئـەو قسەی لەگەڵ مندا دەکرد، بەندەیش پێدەکەنیم و دەمگوت:
- یەس یەس..
کە لە ماڵەکەی هاتینە دەرەوە پێم گوت(گودبای)..باوکم لێم نزیککەوتەوەو گوتی:
- ئەمە چیت پێدەگوت تا ئەوەندە پێبکەنێ؟
- بینیم کابرا سماق دەفرۆشێ ناچار هەندێ قسەی خۆشم بۆ کرد..
سێهەم وەرگێران ئەو کاتە بوو کە لەقۆناغی ئامادەییدا بووم..
لەوکاتەی لە بان پرد دەپەڕیمـەوە دوو لاوی ئینگلیـزم بینـی پرسـیاری شـتێك لـە خەڵکەکـە دەکەن.لێیان نزیك کەوتمەوەو خۆم تێکەڵ کردو تێگەیشتم دەیانەوێ بچنە(بوغاز)و پرسیاری ئەو شوێنە دەکەن کە پاپۆڕی لێ وەرێدەکەوێ .پێمگوتن:
- بابەیەکەوە بڕۆین منیش دەچمە ئەوێ..
مەبەسـتم ئـەوە بـوو ئینگلیزییەکـەم بـە هێزتـر بکەم،چـونکە مامۆسـتای ئـەو کاتـەی وانە(ئەفسەرێکی دەریاوانی خانەنشین) زۆر جار دەیگوت:
- تێکەڵ بوون فێری زمانتان دەکا..
ئیدی بەباشی لەیەکتری حاڵی دەبووین. یەکێکیان بلـوزێکی وەرزشـانەی دەبـەر بـوو لەسـەری نووسرابوو(رۆیاڵ ئیر فۆرس- هیزی ئاسمـانیی پاشـایەتی).وەکو تێگەیشـتم ئەفسـەری یـەدەگ وفەرماندەی پەلێکی فڕین بووە وئەندازیاری دامەزراندنی کارخانەیشی کردووە.ئەوکاتەی پلیتی پاپۆڕمان دەکڕی، گوتی:
- کیوی کلیر
هەرچەندەی هێنام بردم مانای ئەو وشەیەم نەزانی. خۆیشی نـەی دەزانـی چـۆنم تێبگـەێنێ بۆیە دەیقیژاند:

- کیوی کلیر..
فرهەنگێکی بچکۆلانەی گیرفانم وێبوو، نەخێر ئەویش دادی نەدام..
گوتم:
- ئەم کیوی کلیرە چیە؟
- کیوی کلیر.. نازانی کیوی کلیر چیە؟
خەڵکمان لێ کۆبوونەوە.. یەکێ لە کرێکارانی پاپۆڕ گوتی:
- خانە وێران یەك سەعاتە نازانی کابرا چ دەڵێ.. کەوەکلەر..
- تەحا..دەیانەوێ بڕۆنە کەوەکلەر!!
پلیتمان کڕین و سەرکەوتین .. ئینکلیزەکـان هەریەکـەو دووربینێـك و کامێرایـەکی لـە ملـەو وێنەی ئەو ناوچانەیان دەگرت.کە پاپۆڕ لە بەیگۆز وەستا، پۆلیسێك سەرکەوتە بـان و هـەردوو گەنجەکانی دەسگیر کردن.لە بیرمە ئە کاتـە ئـاوازی زۆڕنـای ئـەڵمان بەجۆشـتربوو، ئـەمریکاو ئینگلیز بێگانە بوون...
زۆر پاڕانەوە جێیان نەهێڵم .ئیدی بەیەکەوە چووینە پۆلیسخانەو لە مەسـەلە گەیشـتم..کە لـە بوغاز پەڕینەوە ئەمانە بەدووربین تەماشایان دەکرد و وێنەیان دەگرت.بابایەك وەستانی پـاپۆڕی بەهەل زانیووەو دەبەزیوەو ئاگاداری پۆلیسی دەریای کردووە،کە بەڵێ گاورێـك وێنـەی ناوچـەی بوغازی پیرۆز دەگرێ و ئەوانیش ئاگادری پولیسی بەیگۆزیان کردووە و دەسگیریان کردن.بەهۆی وەرگێڕانـی بەنـدە ئیفادەیـان وەرگـیراوو پۆلیسـێکیان وەگەڵـداین و ڕەوانـەی بەڕێوەبەرایـەتی ئاسایشی ئیستانبوولٚ کران وپاش ئەوەی بۆجاری دووەم ئیفادەیان وەرگـرتن و دەسـتیان بەسـەر فیلمی کامێرا داگرت، ئازادکران.
لەحەد بەدەر سپاسی منیان کردو داوەتی نانی نیوەڕۆیان کردم لەو هۆتێلەی وا لێـی دابـەزیون. بەر لە خواردن قاپێك وێسکییان لەبـەردەم دانـام..دەزانن ئـەو کاتـە بەدەگمـەن خـەڵك نـاوی وێسکییان بیستبوو؟ منیش ئەمە یەکەم جارە لە ژیانمدا دەخۆمەوە.
هەرکە پەرداخی من بەتاڵ دەبوو بە جووتە پڕیان دەکردەوە..ئەوەندە سەرخۆش بووم نـەمتوانی تێیان بگەیێنم کە با هەریەکەو پەرداخی خۆی داگرێتەوە..دەمگوت: وانەر.. وانەر..
بەم حاڵە بۆ جاری سێهەم وەرگێڕانەکەم فەشەلی هێناو بووە مایەی گاڵتـە جاڕی.بـەلام ڕەنگـە دڵتان وەرگێڕانی چوارەمم بگرێ..

لەسەرەتای دەسپێکی یارمەتیی ئەمریکا بۆ تورکیا،دەبوو وەفدێکی ئەمریکی بوئەو مەبەستە بگا.ئەو دایەرەی کە ئیشم تێدا دەکرد(ناکرێ ناوی بهێنم چونکە دایەرەیەکی نهێنییە)بەدوای وەرگێڕێك دەگەڕان دواجار منیان دۆزیەوە. بەڕێوەبەر داوای کردم کە چووم سێ کەسی لا دانیشتبوون..گوتی:
تۆمان هەڵبژارد ببیتە ورگێڕی سەرۆکی وەفد.
- دەخیلە گەورەم بەندە ئینگلیزیی دەریایی بەڵەد نیم..
یەکێ لە سێ کەسەی دانیشتبوون زۆر بێ شەرمانە گوتی:
- نازانی؟ نا! نەخێر دەزانی..
- جا گەورەم ئەگەر بزانم بۆ دەڵێم نازانم؟من شانازی بەم ئەرکەوە دەکەم .بەلاّم ئەگەر سەرۆکی وەفد تورکی دەزانێ ئەوە لە خزمەتیدا دەبم و بەیەکەوە هەموو ئیستانبووڵ دەگەڕێین..
- جا توخوا وەرە .. باشە بوئەمریکی تورکی بزانێ؟
- قەیناکا ئەگەر زۆر لێرەدا دەمێنتەوە ئەوە فێری تورکی دەکەم.
- نا نا ..تۆ ئینگلیزی دەزانی..
- باوەڕناکەم.بەلاّم مادامکێ ئێوە دەڵێن کەواتا دەزانم..
- بێگومان دەزانی..تەماشای دۆسیەی کەسێتیمان کردووی..لە فێرگەدا ئینگلیزیت خوێندووە..
جا هەر من ئینگلیزین خوێندووە؟
- قوربان دەڵێم نازانم ، یەکێك پەیدا بکەن بیزانێ.
- بەڵێ دەزانین خەڵکی دیکە هەن ،بەلاّم وەکو دەزانی ئەم ئەرکە نهێنییە و زۆریش نهێنی و هەرگێز ناکرێ  بە یەکێکی دیکەی بسپێرین..لەبیرت نەچێ لە بڕگەی زمانی بێگانەی تۆماری کەسێتیی تۆدا نووسراوە(زمانی ئینگلیزی دەزانێ و بەڕەوانی قسەی پێدەکا)..بەگوێرەی ئەم زانیارییە تۆ تەنیا پالێوراوی ، بەتایبەتی کە کەسێکی باوەڕپێکراویشی.
سێ ڕۆژی دیکە وەفد دەگا..شەوو ڕۆژم بەیەکەوە وەنان تا ئەوەی هەموو سالاّنە لە بیرم کردوون وەبیرخۆمیان بهێنمەوە..
پێشەکی هەوڵمدا ئەو شتانە فێربم کە ڕنگە جێگەی بایەخی سەرۆکی وەفد بن.  هەندێ پرسیارو وەلاّمم ئەزبەر کردن و لە دەفتەرێکی بچکۆلاّنەدا یاداشتم کردن و گوتم ئەگەر ئەم شتانەم لێ بپرسێ ئەوە زۆر بەرێکوپێکی لەیەکتر حالّی دەبین. لە دلّی خۆمدا گوتم بێگومان پیاسەیەکیش بە ئیستانبوولّدا دەکەین، هەر بۆیە زانیاریم لەمەر شوێنەوارەکانەوە کۆکردەوەو

وەکو بزانم سەرۆکی وەفد ئەدمیرالی دەریایەو هەر زانیارییەکی پێوەندیی بە بەربەرۆسەوە بێ، ئەزبەرم کردن.
دوواجار وەفد گەیشت و لە شوێنی حەسانەوەیاندا چاوم پێیان کەوت.پاشان سەرکەوتم و چوومە ژووریٚ سەرۆکی وەفدو بەئاسانی خۆم پێناساند کە بەڵێ وەرگێڕی شەخسیی ئەوەم..هەندێ ورتەی لێوە هات حەشتەبای تێنە گەیشتم.
با بۆ خۆی بلێ. من ئەو دەڵێم کە ئەزبەرم کردوون.دەگەڵ ژەنراڵ دابەزیم و هاتینە شەقام.بەلاٚم هەریەکەو ئاوازێك دەژەنین..زۆر دڵپەست بووم..بیرم کردەوە با فێڵێکی لێ بکەم بەوەی بەردەوام پرسیاری لێ بکەم و ماوەی نەدەم دەم بکاتەوە:
- گەورەم سەفەرەکەتان چۆن بوو؟
نەمزانی چی وەلاٚم دامەوە.
- پاشان بۆ کوێ دەڕۆن؟
وەلاٚمی دایەوە بەلاٚم نەمزانی چی گوت..ئیدی بەردەوام لە منەوە پرسیار لە ژەیراڵیش وەلاٚم.. ئیدی شەرمم نەماو بەدەوام پرسیارم لێدەکرد. لە هەڵسوکەوتییەوە تووڕەبوونم بەدی کرد..
باشە سەیر نیە کابرا تەنانەت یەك تاکە پرسیاری لیٚنەکردم لەوانەی خۆم بۆئامادە کردبوون؟ بۆیە لە خۆمەوە باسی بەربەرۆس و گرتنی شاری ئیستابوولم بۆ دەکرد..ژەنڕاڵی کلۆڵ سکووتی لێکردو بە ئەمان و زەمان دەمی نەکردەوە.
ژەمی نیوەڕۆم لە هۆتێلدا خواردو لە هۆڵی ئیستراحەتدا چاوەڕوانی بووم کەچی هەر دانەبەزی.یەکێ لە بەردەستەکان لێم نزیکەوتەوەو گوتی:ئەدمیرال سەفەری ئەنقەڕای کرد..
بەهۆی وەرگێڕانی منەوە وەفد بەرنامەی سەردانی خۆی گۆڕی. بەهەرحاڵ دووای مانگێك نامەیەکم وەدەست گەیشت تەمغەی ئەمریکای وەسەرەوە بوو.زەرفم هەڵپچڕی نامە لە سەرۆکی وەفدەوەیە، دەڵێ:
- زورٚ سپاست دەکەین لەسەر ئەو یارمەتییەی ئێمەت دا لە ئیستانبوولٚ ولەسەر ئەوخزمەتەی بە ئێمەت گەیاند.
ئیدی لەو رۆژەوە هەولدەدەم بەتەواوەتی فێری ئینگلیزی ببم و زۆر بە جوانی دەگەڵ ئەمریکایی و ئینگلیزان قسە دەکەم..بەلاٚم ئەوان بۆ لەگەڵ مندا قسە ناکەن؟بێگومان ناتوانن ..چونکە دەبێ وەکو من هەوڵ بدەن فێری ئینگلیزی بن!

# خاڵە گۆهەر

یالّچین هاوڕێی منداڵیمە، دەمزانی کتیبخانەی ماڵەکەیان پڕیەتی لە کتێب. ماڵەکەیان کۆشکێکی بەرزو زەلامەو دەکەوێتە نێو باخچەو دارودارستان کەچووینە ژوور گوتم :

-کۆشکێکی جوانتان هەیە

گوتی:

-کۆشکی گۆهەری پوورمە.

منی بردە ژوورێك ئەوەندە کتێبی تێدا بوو کە نەمدەزانی تەماشای کامیان بکەم ! یالّچین گوتی:

-با چاییش هەر لێرەدا بنۆشین.

خەریکی دیقەتی کتێبێکی جلدکراو بووم ،کە دەنگێك لە نهۆمی دووەمەوە هات:

- ئارمانج گردی بەرامبەرتانە، ئاگر.. ئاگر.

زۆرم بیر لێ نەکردەوەو مەشغوولّی کتێب بوومەوە کە دووبارە دەنگەکە هاتەوە:

-بۆلای راست، ئاگر

ویستم لە یالّچین بپرسم، بەلّام دەنگ لە دەنگی منداڵێك دەکا خەریکی گەمەو یاری سەربازیی بێ.

ئێمە خەریکی چا نۆشین بووین کە دە نگ جارێکی دیکەیش بەرز بۆوە.

-ئامادەباش..ئاگر.. ئاگر

پاشان ڕمبەیەکی گەورەو توند هات و دەرگا کرایەوە، بنیادەمێکی سەیر کە نە لە ئافرەت و نە لە پیاو دەکا خۆی کردە ژوورەوە.قژی یەکپارچە سپی، بالّابەرز کلّاوێکی قوماندانەکانی زمانی کۆنی لەسەرناوە. دیقەتی قژو رووی بدەی ئافرەتە. بەرگی پیاوانەی دەبەری جۆرەها نیشان ومەدالیای پێوەیە.چەکمەیەکی رەشی دپێیەو گۆرەوییەکی ژنانەی وەبان ، شیرێکیشی لە نێو قەدی ئالّاندووە. هەرکە چاوم پێی کەوت یەکسەر بازمدا، یالّچین توند مەچەکی گرتم و وای پێناساندم:

-گۆهەری خالّۆم !

رووی تێکردم و گوتی:

-چۆنی کوڕەلاو؟
- سپاست دەکەم قوربان...
- بە مولازمێکی سەربازی ناگوترێ : سپاست دەکـەم ، دەگـوترێ: سـەلامەت بـی-رووی لـە یالْچین کرد-ئافرەتە تۆپچییەکان گیای وشکیان پێویستە.
پاشان نەعرەتەیەکی لێداو رۆیشت.
یالْچین گوتی:
- باسی گۆهەری پوورمم بۆکردبووی وا نیە؟
- نەخێر هیچت باس نەکردووە.ئەریٚ بەڕاست ئەوە پوورە گۆهەر بوو یاخالْە گۆهەر؟
- هەردووکیان بوو. گوqهەری پوورم لەم کۆشکەی کـە لـە مىردییـەوە ماوەتـەوە بـە تـەنیا دەژیاk دووای ئەوەی منداڵەکانی بوونە خاوەن ماڵی خۆیان و تە نیا کچێکی بچووکی مـابوو. کە باوکم لە ئەنقەرەوە فەرمانی دامەزراندنی بۆ ئیسـتانبوولْ دەرچـوو، ماوەیـەك لـە هۆتێلـدا ماینەوەو بە دووای خانوێك دەگـەڕاین بـەکرێی بگـرین. پـوورە گۆهـەر خەبـەری بـۆ نـاردین کەبەتەنیا لە کۆشك دا وەڕز دەبـێ: پیـاوی چـاك بـن وەرن بەیەکـەوە بین.دایکیشـم خوشـکی بچوکیەتی و جیاوازیەکی تـەواویان لـە نـیqوان تەمەنـدا هەیـەو هەرچـی پـوورم بلْـێ ڕەتـی ناکاتەوە.هاتینە کۆشك. ئەو کاتە کوڕە گەورەکەی پـوورە گۆهـەر لـە ئـەمریکا بـوو. پاشـان کچەکەیشی مێردی کردو ئێستا وا لـە (ماچکا)یە.چـەند سـالْ وا بـەڕێوە چـووین. بەیانییـەك هێشتا نە من و نە باوکم بەرەو کار نەڕۆیشتبووین، خەریکی پێلاو دەپیٚکردن بووین کە دەرگـا لێدراو من کردمەوە. پۆلیسێکی جانتا وەدەست لە بەر دەرگا بوو، گوتی:
- گۆهەر لەم ماڵە دادەنیشیٚ؟
بیٚ حورمەتیی پۆلیسم بەسەرخۆ نەهێنا. ئەوکاتە پوورە گۆهەر تەمەنی حەفتاو چوار سالْ بوو، کۆنە ئافرەتێکی ئیستانبوولْی بە هەیبەت .خەڵکی گەڕەك و ئەوانەی دەیانناسی ریٚزیان دەگرت و بە -خانم-و -خاتوون- ناویان دەبرد. زۆر کەس نەیدەزانی ناوی چیەو هەر بە -خانمە فەندی- یان ناودەهێنا..دەیانگوت: کۆشکی خانمەفەندی، باخی خانمەفەندی..
بەپۆلیسم گوت :
- چیت لێی دەویٚ؟
- بانگی کەن با بیٚ.
ئەو کاتە پوورە گۆهەر لـە شـوێنی خـۆی نـەدەجوولا، نـەك لەبـەر نـە خۆشـی بـەڵکو لەبـەر قەڵەوی.گوتم:

- ئەو نایە، چت دەوێ بەمن بڵێ.
باوکیشم هاتە بەردەرگاو بە پۆلیسی گوت نایە.
-بۆچی نایە؟ ئێمە دەزانین چۆن خەڵك دەهێنینە دەرەوە!
باوکم گوتی:
- باشە بزانم چۆنی دەهێنن؟
- یانی خۆتان لە قەرەی هێزی یاسا دەدەن؟
- کاکە یاسای چی ! ئەوەندە قەڵەوە ناتوانێ لە نهۆمی دووەمەوە دابەزێ!
پۆلیس سەری سوڕما:
-گەنج ئەوەندە قەڵەوبێ لە پلیکانەو دانەبەزێ!
-گەنج؟ گەنجی چی؟ لە حەفتا بەسەرەوەیە
پۆلیس چاوی کردەوە کاغەزی دەستی خوێندەوە:
- لێرە نووسراوە بیست و چوار. باشە لەو حەفتا ساڵەیدا سەربازی کردووە؟
-کێ؟
-گۆهەر.
-ئەوەتۆ دەڵێی چی؟ گۆهەر خان ئافرەتە
- هەڵلا هەڵلا.. قاچاغی سەبازی یەو تەجنید بەدووایەوە دەگەڕێ.. کەواتا ئەمە گۆهەرێکی دیکەیە.
دایکم بەو مانایەی شارەزای گەڕەکە گوتی:
- لەم ناوە گۆهەری دیکە نیە
پۆلیس جارێکی دیکەیش دیقەتی ناوو ئەدرەسی کاغەزی دەستی دایەوە خاڵ بەخاڵ لەئێمەی دەپرسی و ئەدرەس تەواوە. ناچار گوتی:
-تکا دەکەم بادابەزێتە خوارەوە، ئەمە ئەرکێکی نیشتمانییەو هەمووومان دەگرێتەوە. دەوڵەت دەستی درێژە و لەهەر کوێ بێ دەیگرێ.
پۆلیس دەستی کردە ئامۆژگاری. باوکم گوتی:
- ئەو ناتوانێ دابەزێ، فەرموو تۆ سەرکەوە.
دایکم گوتی:
- تکا دەکەم پێڵاوەکانت داکەنەو لەسەرخۆ بڕۆ، دڵی زۆر ناسکە، زوو تووڕە دەبێ.

دەگەڵ پۆلیس سەرکەوتین ،پوورە گۆهەر لە قوژبنێك دانیشتووە ، ئێمەی بینی پەشـۆکا. بـەڵام کە تێمان گەیاند دەوڵەت داوای دەکا بیّ سەربازی بکا، پێکەنی وەسەر خۆی نـەهێناو وەڵامـی پۆلیسی دایەوە:

-ناوت؟

-گۆهەر

-تەواوە، شۆرەتت؟

-یەن ئۆغلۆ.

- ئەمەش تەواوە، ناوی باوکت؟

-سەردەستەی تۆپچیان حەلیم پاشا.

- یەکدەگرێتەوە، لێرەیش حەلیمە، ناوی دایکت:

- وەسامەت.

- هەمووی تەواوە، بەڵام یەکەم تەمەنت ودووەم کە ئافرتی ،ئیشـەکەی تێکـداوە! ئوسـوولەن دەبیّ وێنەیەك لە تۆماری سەرژمێریی دایەرەی نفووس بێنن و ئێمەش بۆ تەجنیدی دەنووسین. وەك پۆلیس فـەرمووی-ئوسـوولەن- وێنەیـەکمان لـە تۆمـاری نفووسـی پـوورە گۆهـەر بـردە پۆلیسخانە. دەپازدە رۆژی پێچوو کە دیسـان سـەرو کەللـەی هـەمان پـۆلیس و کۆمیسـێرێك وەدەرکەوتەن کە دەمێکە لە گەڕەکی -ساری یەر-دا کاردەکا و پوورم دەناسیّ:

- خانمەفەندی هاتووین مەحزەرێك رێك بخەین.

پوورم گوتی:

-رۆڵە کە تۆ دەمناسی مەحزەری بۆچیە؟

کۆمیسێر گوتی:

- ئاخر ئەمە ئوسوولە.

مەحزەرێکیان نووسی کە بەڵێ گۆهەری پوورم ئافرەتەو پیـاو نیـە،پۆلیس و کۆمیسـێرو ئێمـە تێکڕا ئیمزامان کرد. کاتێکی دیکەیشی خایاند، کە رۆژێکیـان دوو دانـە ئینزبـات وبۆلیسـی جارانمان لیّ وەژوورکەوتن.کۆمیسێرخەبەری رەوانە کردووە کە بـیّ زەحمـەت بـا پـوورە گۆهـەر سەرێکی دایەرەی تەجنید بدا.

گوتمان : ئەمە چەندی بەچەندە،هەرجارەی قەوانێك لێدەدەن؟

پۆلیس گوتی:

-ئاخر جەناب ئەمە ئوسوولّە

ئەوەندە باسی لە ئوسوولّ کرد،گێژو وێژی کردین.

پوورە گۆهەر گوتی:

- مادام ئوسوولّ وایە دەچم .

بە باوەش پوورمان لە نهۆمی دووەمەو دابەزاندو سواری ئۆتۆمبیلمان کردو بردمانە دایەرەی تەجنید. بەڕیوەبەرِ عەقیدەو شتێکی لە پوورم پرسی ئەویش وەلاّمی دایەوەو گوتی:

-مێردی من ژەنراڵ بوو بیست ساڵ دەبیّ مردووە و منیش تەمەنم حەفتا ساڵە چۆن دەبیّ بۆ سەربازیم بەرن؟ من خێزانی مەمدووح پاشام !

هەرکە ناوی مەمدووح پاشای بیست، عەقید لە شوێنی خۆیەوە دەرپەڕی و پڕی دایە دەستی پوور گۆهەرو ماچی کردو گوتی:

- توخوا خانمەفەندی من ناناسی؟ من لە خزمەت مەمدووح پاشادا بووم و پیاوەتی لەسەرمە.

بەڕێوەبەری دایەرەی تەجنیدیش ناسیاو دەرچوو. عەقید گوتی:

- هیچ نیە.بەلاّم تەنیا تکایەکم هەیە ئەویش ئەوەیە روونووسێکی نفووسمان بۆ بێنن .پوورم گوتی:

- توخوا ئەمە حاڵە، مەحەزی پۆلیسخانەتان بۆهاتووە، تۆش چلّ ساڵە من دەناسی ئینجاش حەواڵەی نفووسم دەکەی؟

-ئاخر ئەمە ئوسوولّە،ئوسوولّ.

لە دایەرەی تە جنید بەدەرکەوتین و هاتینە دەرەوە . دووسیّ رۆژی نەبرد پۆلیس و ئینزبات بەر دەرگایان لیّ گرتین:

- تۆماری نفووس نە هات ، ئەگەر بە دستمان نەگات ناچارین سەوقی سەربازی بکەین.

نەخێر ترسمان گەیشتیّ کە پوورە گۆهەری تەمەن حەفتا ساڵی و قەڵەو دەبەنە سەربازی. کچەو زاوای گەیشتنیّ و بەیکەوە بەرەو دایەرەی نفووس بەڕیّ کەوتین، بەرێوەبەری نفووس هاوپۆلی زاوای پوورم دەرچوو، یەکدوو جاریش هاتۆتە کۆشك، هەڵسایە سەرپیّ و دەستی ماچ کردو گوتی:

- بەندە خانمەفەندی دەناسم.

خۆشییەکمان هاتەوەبەر. بەرێوەبەر مامەڵەی لە فەرمانبەر وەرگرت و تۆماری نفووسی هێنایە ژوورەکەی خۆی و بەدووای نێوی گەڕا. ئێمەیش خەریکی چای نۆشین بووین. چەند

لاپەڕەیەکی هەڵدانەوەو گوتی:
- بەڵێ هەڵەیەك رووی داوە، لە جیاتی مێژووی لـە دایـك بـوون بنووسـرێ ١٩٠١، نووسـراوە ١٩٥١واتا خانم کە تەمەنی حەفتاو چوار ساڵە ،دەبێتە بیست و چـوار سـاڵ،-گۆهـەر-یشـیان بەپیاوحسێب کردووە.
دامانە قاقای پێکەنین. بەڕێوەبەر گوتی:
-بۆ راست کردنەوەی ئەم هەڵەیە دەبێ سەردانی دادگا بکەن.
پوورە گۆهەر گوتی:
-ئەمان ،دادگای چی؟
-ئاخر خانمەفەندی ئەمە ئوسووڵە،تابڕیاری دادگامان بۆ نەیەت ناتوانین هیچ شتێك بگۆڕین.
پوورم تووڕەبوو،گوتی:
-جا من ئەم هەڵەیەم کردووە؟ کێ هەڵەی کردووە با ئەو بچێتە دادگا!
- خانم ئەم دادگاییکردنە شتێکی گرنگ نیە، ئوسووڵەن دادگایەکی هاکەزاییی یە.
گەڕاینـەوە ماڵـەوە. پـۆلیس و ئینزبـات بـەر دەرگـا بـەرنادەن. تـەلگرافێکمان بـۆ کـوڕە بچکۆلانەکەی رەوانەکرد کە لە ئیزمیر دادەنیشێ:
( فریای دایکت بکەوە ناوی بۆ سـەربازی هـاتووە).کوڕە بەپەلـە بـەخۆی وبـە ژن و منداڵـەوە هاتن . پوورە گۆهەر هەمووманی کۆکردەوە و گوتی:
-کوڕینـە مەسـەلە ئوسـووڵ و موسـووڵ نیـە وئیشـەکە گاڵتـەی پـێ نـاکرێ و دەمکەنـە سەرباز..پیاوی چاك بن بەهەندی هەڵگرن.
کوڕەی لە ئیزمیر هاتوو پارێزەرێکی دۆستی گرت. هەندێ جاریش شـانس دەور دەبینـی.دادوەر خەڵکی —ساری یەر - ـەو پوورە گۆهەر دەناسێ.
رۆژی دادگا پوورە گۆهەریان لە قەفەزی تاوانباران پەستاو پارێزەر دەستی بە بەرگری لێکـردن کرد، کە گۆهەر خانم ئافرەتەو منداڵ و نەوەی هەیـەو بەتەمەنـە . دادگـا داوای دوو شـایەدی کرد . پوورم وەك باروت لە رووی دادوەر تەقیەوە:
-کوڕە تۆ من ناناسی؟ئیدی شایەدت بۆ چیە؟
- تکا دەکەم پوورێ گیان، ئەمە ئوسووڵەو شایەدی دەوێ ،دووان پەیدا بکەو بەس.
کوڕ، زاوا،بووك، برا،خوشك،نەوە، تەواوی خزم و خیش لە نێو ئیشـەکە دایـن. نامەیـەکی بەپەلەمان بە فرۆکە بۆ کوڕی گەورەی پـوورێ رەوانـەی ئـەمریکا کـرد:(زوو وەرە دایکـت

دەکەنــە ســەرباز).حەفتەیەکی نــەبرد وەڵامــی داینــەوە:(ئێوە شــێت بووینە؟)نامەیــەکی دیکەمان رەوانەکرد:( واز لە شێتی و مێتی بێنە، دایکت دەکەنە سەرباز).ناچـار بـە ژن و منداڵەوە هاتەوە.

ئینجا وەرە شایەد پەیدا بکە. بەهەر کوێمان دە گوت خـۆی لێ دەکێشـایەوە دەیگـوت : بابـە ئاخر بەر لە حەفتاو چوارساڵ هێشـتا باوکیشـم لـە دایـك نـەبووبوو، چـۆن شـایەدی وابـدەم؟ دەمانگوت: بابە تەمەن گرنگ نیە ئەمە ئوسووڵەو دەبێ شایەد هەبێ. دەیانگوت: خوا هەیـە، ئێمە شتێك نەزانین شایەدی نادین...خوا تووشــی بــەڵای گــەورەمان دەکا،ئاخرسـزای شـایەدی بەدرۆ قورسە.

بەهەرحاڵ و دەردەسەری دووشایەدمان پەیـداکردن، یـەکیان تەمــەن پـەنجاو پێـنج و دوومیـان شەست ساڵ. ئەمجارە دادگا بڕیاریدا دەبێ پوورە گۆهەر -موعایەنە- بکرێ .لە هـۆڵی دادگـادا کچی پوورە گۆهەرو هەردوو کوڕی و هەشت نەوەی وەستاون .خۆمـان گەیانـدە دادوەر گلـەمان لێکرد، کەچی گوتی:

- برادەرینە منیش دەزانم گۆهەر خانم ژنە، خۆ من لەسەر دەستی ئەو لـەدایك بوومــە، بـەڵام ئەمە ئوسووڵە دەبێ موعایەنە بکرێ.

کەوتینە دووای موعامەلە. دەستەی تەجنید سەریان تێکردووین:

- ئیستەرەم دەبێ گۆهەر بکرێتە سەرباز چونکە ئەوە چەند مانگە مامەڵەتان تەواو نەکردووە.

ئەمجارە نۆرەی پوورم بڵێ:

- دووای ئەم تەمەنە درێژە تازە ئیسپاتی مێیینەییم بکەم ؟ نایکەم!

- ئەمان پوورێ، ئاخر ئەمە ئوسووڵە ئووسووڵ.

فایلمان گەیاندە نەخۆشخانەی رەسمی . لە شانسی پوورێ ئەو دکتـۆرە ژنـەی موعایەنـە دەکـا دۆستی کوڕی گەورەی دەرچوو، سەرۆکی دکتۆرەکانیش یەکێك بـوو لـە قوتابیـانی مەمـدووح پاشا.خۆمان گەیاندێ، گوتی:

- ئەمڕۆ نابێ!

- بۆ نابێ؟

- ئەمڕۆ لیژنە دانانیشێ، تەنیا راپۆرتی منــیش نـایخوا دەبــێ تــەواوی ئەنـدامان ئیمـزای لەسەر بکەن.

کوڕی گەوری پوورێ گوتی:

- لیژنەی چی؟ تۆ دایکم ناناسی؟

-دەیناسم برا دەیناسم.. بەڵام ئەمە ئوسوولەو دەبێ پەیڕەو بکرێ. بە ناسینی من نابێ.

هەموویان دەزانن پوورە گۆهەر ژنەو پیاو نیە و تەمەنی حەفتاوچوارساڵەو بیست و چوار نیەو دووکوڕو کچێك و هەشت نەوەی هەیە، بەڵام هەر یەکەو ئیشەکە لەسەر خۆی لادەباو دەیخاتە سەر ئەوی دیکە.

دوواجار راپۆرتی پزیشکمان وەرگرت .رۆژی دادگا هوڵ جمەی دێ .. خزم و دۆست و ناسیاو، ناسیاوی دۆستان، خەڵکێك هەر دووربە دوور ناویان بیستووە هاتوون. بە تایبەتی کە رۆژنامەکان هەواڵی بەسەربازکردنی گۆهەر خانمیان بڵاوکردووتەوە.

راپۆرت خوێندرایەوە، دادگا بڕیاریدا کە بەڵێ گۆهەر ئافرەتەو پیاونیە ، کە لەناکاو پوورە گۆهەر قیژاندی:

- نەخێر من پیاوم.

دادگا کش و مات بوو ، پاشان درایە قاقای پێکەنین، گۆهەر درێژەی دایێ:

- من ئوسوولەن پیاوم. راپۆرتی پزیشکی ساختەیەو شایەدەکان درۆدەکەن و ئامادەم بمکەنە سەرباز.

بەڵێ دادگا بڕیاری خۆی دا، بەڵام لەو رۆژەوە پوورە گوهەر جل وبەرگی سەربازی مێردی دەرهێناوەو دەبەری دەکاوهەر لە بەیانییەوە تائێوارە مەشق دەکاو دەخولێتەوە قایلییش نابێ کەس پێی بڵێ پوورو دەبێ بڵێن خاڵۆ گۆهەر.

جارێکی دیکەیش لە نهۆمی دووەمەوە نەعرەتە بەرزبۆوە:

- خۆتان چوست کەن ئامادەبن..ئاگر، ئاگر

# خانمی مامۆستا

ئەو رۆژنامەیەی بەندە کارم تێدا دەکرد بەپێی یاسای تەواری بەم شێوەیە داخرا:
کاتژمێر لە نۆ نزیك دەکەوتەوە ئەوکات بەندە پەیامنێری رۆژنامە بووم لە وەزارەتی دادو دەزگاگانی ئاسایش دا.ئێمە خەریکی کار بووین کە حەسەنمان لێ وەژوور کەوت.حەسەن پۆلیسی سڤیلەو لە هۆبەی یەکەمی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش دا فەرمانبەرە و بەرپرسی کاروباری رۆژنامەوانییە.پیاوێکی رەنگ ئەسمەری دەم بە پێکەنین،بەلاّم رۆژنانەنووسان لە زەردەخەنەکەی رەشبینن.
حەسەنی پۆلیس جارێکیان بە پێکەنینەوە هەواڵی مردنی رۆژنامەنووسێکی پێ گوتین وەك مزگێنیمان بداتێ!
کە سەرنووسەر چاوی بەحەسەن کەوت لەبناگوێمەوە گوتی:
-هەواڵی ناخۆشی پێیە!
پاشان حەسەن مزگێنیی داینێ وگوتی:
-ئاگادارتان دەکەم کە بڕیاردرا رۆژنامەکەتان دابخرێ.
وا وشەی ئاگادارتان دەکەمی لە دەم دەرچوو وەك بڵێ پیرۆزباییتان لێدەکەم.
سەرنووسەر پرسیاری لێ کرد:
-بۆ داخرا؟
حەسەن وەلاّمی دایەوە:
-فەرمانی یاسای تەوارییە.
لەگەڵ وشەی تەواریدا پێکەنی و لەو پەڕی دڵخوشیدا بوو.
کە کار پێوەندیی بە تەواری بێ کەس ناپرسێ بۆ ؟ چۆن ؟ لەبەرچی؟
سەرنووسەر گوتی:
-کوانێ فەرمانی نووسراو؟
-پاشان ڕەوانەی دەکەن.

بەر رەحمەتی خوا بکەویٚ، حەسەن بە باشترین شێوە ئەرکی خۆی بـەجیٚ دەگەیانـدو چـاوەڕوانی ئەمری نەدەکرد چاپ بکریٚ ویەکسەر دەهات ئاگاداری دەکردین، تەنانەت هەندیٚ جار نووسـراو هەر رەوانە ناکەن...واتا ئێمە ئێستا لە بارێکی دیموکراتیدا دەژین ئەگەر لەگەڵ شەش مـانگی بەر لەئێستادا بەراوردی بکەین.

بەهەرحاڵ ئەوەندەی نەبرد ماتۆڕێك لەبەر دەرگای رۆژنامە وەسـتا. جـاران دەنگـی ماتۆڕمـان گویٚ لیٚ بوایە پێمان وابوو مەسـەلە پێوەنـدیی بـە بلاٚوکردنـەوەی هەواڵێکـەوە یـا داخسـتنی رۆژنامەوە هەیە.ئەمجارە پۆلیس فەرمانی چاپکراوی داخستنی رۆژنامەی بۆ هێنایـن.

چەقۆیش دەممان ناکاتەوەو بیٚ ئەوەی کەس هیچ بڵیٚ هەریەکەو بەلایەکـەوە رۆیشـتین.ژمارەمان بیست و شەش فەرمانبەر بوو،حەوتمان بەر لە دە رۆژ لە رۆژنامەیـەکی داخراوبـە پێـی یاسـای تەواریەوە گواسترابووینەوە ئێرە.

ئەوکاتە سنووقی دابیکردنی کۆمەلاٚیەتی مانای نـەدەزانراو خـاوەنی رۆژنامـە ناچـار نـەدەبوو مووچەی کارمەندان بدا. واتا ئێمە تێکڕا لە بێکاری و بیٚ پارەییدا دەژیاین. پاشان لـە مـاوەی دوو مانگدا لە سیٚ رۆژنامەدا کارم کردو هەر سیٚ رۆژنامە بـە پێـی یاسـای تـەواری داخـران. لەبەر ئەوە بەر دەرگای سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران هەمیشە پڕی بوو لە رۆژنامـەنووس و نووسەری بیٚ کار.

ئەو رۆژنامانەی بەردەوامیش بوون ژمارەی کارمەندانی دووقـات زیادیـان کـردو ژمـارەی ئـەو کەسانەی سەرەیان بۆ ئیشوکار گرتبوو لە دە کەس کەمتر نەبوون .

دوو مانگی تەواو بیٚکار دانیشتم. رۆژێکیـان لـە کۆمەڵـەی رۆژنامەنووسـاندا دانیشـتبووین، دۆستێکم گوتی:

-وەزیفەی هەڵەچن لە رۆژنامەکەماندا بەتاڵە، تۆم بۆ ئەو وەزیفەیە پالاٚوتووەو رەنگە دابمەزریٚی ، زوو وەرە تا کەس بەم وەزیفەیەی نەزانیوە.

یەکێك لە چاکەکانی ئەو رۆژنامەیە ئەوەیە کاری زامنە و یاسای تەواری نایگرێتەوەو ..چونکە خاوەنی پەرلەمانتارەو سەر بە حزبی دەسەلاٚتە.بۆیە ترسی داخستن و بێکاریمان نابیٚ.

کە لەو رۆژنامەیەدا دەست بەکار بووم خاوەنەکەی لە ئەوروپا بوو.خاوەن رۆژنامەکان بەگشتی زۆر رەزیل بوون. کەچی نەیانتووانی لەسەر پیٚ بوەسـتن و شـوێنێك بۆخۆیـان لـە ژێـر تیشـکی خـۆر بکەنەوە....تەنانەت زۆربەیان ناویـان رەش بـۆوەو لـە بیرکـران. هـەر وەهـا نـەیانتووانیٚ دەگـەڵ گەشەکردن وبەرەو پێشچوون خۆیان ڕابێنن، کەچی هەرهەموویان بوونە خاوەن چەند ملیۆن لیرە.

لەبـەر ئـەوەی خـاوەن رۆژنامـە پیـاوێکی قرچـۆکە،تەنیا دوو هێلـی تەلـەفۆنی راسـتەوخۆی راکێشاوە، یەکیان لە ژوورەکەی خۆیەتی و هی دووەم لە ژووری نووسەراندایە.من ئێـواران لـەو ژوورەدا کاردەکەم و لەمن بترازێ کەسی لێ نیەو بەتەك ژوورەکە ژووری ئێشکگری شـەوانەیەو کە تەلەفۆنی بۆ دەکەن یەك دوو مست لە دیوار دەدەم و دەزانێ ئەویان دەوێ.

ئێشکگری شەوان گەنجێك بوو حەزی بە پێوەنـدیی بـە ئافرەتانـەوە دەکـردو دۆسـتی زۆری لـە سەماکەرو گۆرانیبێژو ئەکتەری مێینەی سینما هەبوون و شـەوانە لانـی کـەم دەپـازدە لەوانـە پێوەندییان پێوە دەکردو هەرجارەی دەبوو مست لە دیوار بدەم و ئاگاداری بکەم، سەرەڕای ئـەو تەلەفۆنانەیش زۆرجاریش ژن دەهاتنانە ژوورەکەی ،جـا یـا وەلاّمـی تەلـەفۆنی نەدەدایـەوە یـا درانگ دەهات.

خۆشحالّ بووم بەوەی کارێکم دۆزیەوەو زۆر دەترسام وەدەرم نـێن و بێکـار بم لەبـەر ئـەوە دلّـی کەسم نەدەشکاندو دژایەتی کەسم نەدەکردو هەر چیەکیان دەگوت نەمدەگوت نا.ئـەو دۆسـتەی کاری بۆ دۆزیمەوە هەمیشە پێی دەگوتم:

- لە خانمی مامۆستا بترازێ لەکەس مەترسە.ئەگەر لەگەلّ ئەو تێك نـەدەی کـەس ناتوانـێ لێرەت وەدەرنێ.

-جا من چکارم بە خانمی مامۆستایە؟

-وا مەلّێ ..ژنە بەلاّی خوایەو خۆی لە هەموو کارێك هەلّدەقورتێنێ.

تەواوی کارمەندانی رۆژنامە زەندەقیان لە خانمی سەرنووسەر چوبوو.. ناوی سەیرسـەیریان لێـی نابوو وەك شاژن،ئیمپراتۆر..کەسێکت لە رۆژنامە نەدەدۆزیەوە زراوی لە خانم نەچێ.

دووای سێ مانگ لە کارکردنم شەوێکیان خەریکی هەلّچنی هەندێ بابـەتی بوێرانـە بـووم کـە زەنگی تەلەفون لێیداو دەنگی ئافرەتێکم گوێ لێبوو.چەند جارێك مستم لـە دیـوارداو بەژنـەم گوت: ( یەك دەقیقە سەبرکە وا دێ)و تەلەفۆنم بەکراوەیی لە سەرمێزداناو خەریکی کاری خـۆم بووم.کەتـەواوم کـرد بینـیم تەلـەفۆن کراوەتـەوەو مانـای ئەوەیـە ئێشـگر لـە ژووری خۆیـدا نیە..تەلەفونم داخست کەچی یەکسەر زەنك لێیدایەوە:

-فەرموو خانم.

-کوڕە تۆ کێی؟

-لەو تووڕەتر قیژاندم:

-ئەی جەنابت کێی وا بەم شێویەوە دەئاخێوی؟

وامزانی ژنە یەك لەوانەیە شەوانە تەلەفۆن بۆ ئێشكگر دەكاو چوزانم خانمی مامۆستایە؟
ژنە گوتی:
-ئەی داوای ئێشكگری شەوانەم نەكرد؟
-بەڵێ بەندەیش مستم لە دیواردا..
-ئەی بۆ نەهات؟
-جا من چوزانم؟
-هەتیوە دێم و دەمت هەڵدەزڕێنم..
بە گاڵتەوە گوتم:
-لەسەرخۆ خانم..
ژنە دەستی بە جنێودان كرد،جنێوی وا كە لەرووم نایە بیانگێڕمەوە، گوتم:
-من وا پەردەكراوم نەتوانم وەڵامت بدەمەوە.
دەنگی زیاتر بەرزكردەوەو پتر جنێوی دامێ:
-كوڕە هەی شێت و وێت تۆ كەی پەروەرد كراوی؟ هەی بێ تەربیەت..
-دامت داخە ..تۆ خۆت بێ تەربیەتی.
-تۆ كەری...
-كەر تۆی..
-تۆ حەیوانی..
تەماشای ئەم ژنە شێتە! لە جنێودان ناكەوێ..هەرچەندەی منیش هەمان جنێوم پێدەداوەو دەمگوت خۆت.. دوواجار گوتی:
-با بێم ئەنجا تێت دەگەیێنم!
گوتم:
-وەرە بابزانین كێ كێ تێدەگەیێنێ!
-تفوو بێ ڕوشت..
-تفوو لە خۆت.. شێتی كوێرە چت لەمن دەوێ؟
-ئاخ خەریكە دەبووریمەوە..كوڕە ئەی داوای ئێشكگری شەوانەم نەكرد گوتت یەك دەقیقە خانم.. هەی كەرە..
وەك رەشاش دەتەقیەوەو بێ وەستان جنێوی دەداو منیش وەڵامی جنێوەكانیم دەدایەوە:

-تۆ..تۆ..تۆ.

-دەی بانگی ئێشکگری شەوانەم بۆ بکە..

-وس کچێ وس، من لای باوکت کرێگرتە نیم .. یەکێکی دیکە بدۆزەرەوە..

پاشان دووپێلاقەم خێواندنە دیوارو بەئانقەست هاوارم کرد تا ژنە گوێی لێ بێ:

-برا دەورە وەلاَمی ئەم تەلەفۆنە بدەرەوە،بزانە چ جۆرە ئافرەت دەناسی! ئەم بەلاَیە چیە؟

ئێشکگەر هات و دەستی دایە تەلەفۆن:

-فەرموو خانم..ئەمر دەکەن..چۆن؟ نا! چ دەلێی؟..زۆر داوای لێبوردن دەکەم..ئێمە. بەلێ..هەلەچنەو تازە هاتووە..بەسەر چاو.. دلنیابە..ریزم بو جەنابتانە خانم..

کوڕە تەلەفۆنی داخست و رەنگی بزرکاو گوتی:

-ئەوە تۆ چت کرد؟

-چم کرد؟

-جنێوت بەخانمی مامۆستا داوە.

هەروەختەبوو ببوورێمەوە،گوتم:

-لە رۆژنامە وەدرم دەنێن وانیە؟

ئێشکگر گوتی:

-مامۆستا ئێستا لە ئەوروپایە کە هاتەوە دەرت دەکا.

- ئەگەر لێشی بپاڕێمەوە؟داوای لێبووردن بکەم و بلێم هەلەم کرد؟

- باوەڕ ناکەم قەبوولْ بکا..کابرا زۆر لە ژنی دەترسێ و لەترسان دەلەرزێ و ئەوەی ژنی بلێ وا دەکا. کەواتا بێ پارەیی و بێ کاری خۆتان بگرن..لەم بیرۆکانەدابووم کە زەنگی تەلەفۆن لێیداو خانمی مامۆستا لەسەر هێل بوو.لە دلی خۆمدا گوتم من هەر دەردەکرێم و با ئازایانە هەلسوکەوت بکەم. بە تووڕەیی وەلاَمم دایەوەو گوتم:

-چیت دەوێ؟

دامنابوو دیسان هاوار بکاو هەرچیجنێوە حەوالەی گۆڕی باوکمی بکا، کەچی زۆر لەسەرخۆ گوتی:

-پێش کەمێك بۆ وات قسە دەکرد؟ چیە منت نەناسی؟

-نەخێر دەمزانێ تۆ خانمی مامۆستایو وەك دڕندە وای.. بڕۆ وازم لێ بێنە نامەوێ قسەت لەگەلدا بکەم..

ژنە قیژاندی:

-چ دەڵێی؟ یانی دەتزانی ئەنجا وایشت دەگوت؟

-بەڵێ دەمزانی.. چت دەوێ؟

تەلەفۆنەم بەروویدا داخست.

تاکە تیشکێکی هیوا نابینم و بێگومان دەر دەکرێم..حەفتەیەك دووای ئەو رووداوە مامۆستا لە گەشتی ئەوروپاوە گەڕایەوەو رۆژی دوواتر داوای منی مرد..کە چوومە ژوورەوە بیرم لەوە دەکردەوە چۆن وا بکەم بەزەیی پێمدا بێتەوەو دەرم نەکا.. مامۆستا جانەوەرێکە بۆ خۆی..دەستەکانم خستنە سەر زگم و لە بەرامبەریدا وەستام.گوتی:

-وەرە کوڕم دانیشە.

قسەی دەکردو پێدەکەنی..لەسەر کورسیی بەردەم مێزەکەیدا دانیشتم..گوتی:

-پیرۆزباییت لێدەکەم ..یاخواهەر بژی. بەندە تا ژیانم ماوە قەرزاری تۆم چونکە چاوت نوقاندن و دەمت لە ژنم کردەوە..براڤۆ.. ئافەرین..تۆڵەی هەژدە ساڵ خەموخەفەتی منت کردەوە.. ئەوە چۆن وێرای وا جنێوی بدەیتێ؟ باشت کرد..دەزانم چ جۆرە جنێوی لەدەم دێنەدەر.بڕۆ کارگێڕیی نهۆمی ژێرەو، پێم گوتوون پەنجا لیرە پاداشتت بدەنێ.. بڕۆ وەریان بگرە.

پەنجا لیرەم لە ژمێریار وەرگرت و هەر کە زەنگی تەلەفۆن لێیدا رامدەکرد

بە لکو خانم بێو هەندێ جنیوی دیکەی بدەمێ و پەنجا لیرە وەربگرم بەڵام دووای ئەو رۆژە تەلەفۆنی نەکرد.ئێوارەیەکیان خۆی هاتە رۆژنامە و لێم وەژوور کەوت،،گوتی:

-تۆی هەڵچن؟

-بەڵێ..

-تۆ بوویت لە تەلەفۆن جنێوت پێدام؟

زانیم خانمی مامۆستا خۆیەتی. وەزعەکە گۆڕاو نەمتووانی دەم بکەمەوەو تەنانەت سەریشم بەرز نەکردەوە. گوتی:

-پیرۆزباییت لێ دەکەم من ئەو کەسانەم خۆش دەوێن بەراشکاوی هەستیان ناشارنەوە..گوێ مەدەرێ من نەخۆشیی گەدەم هەیە بۆیە هەمیشە هەڵدەچم. بە و کابرایم گوتووە دووسەد لیرەت پاداشت بداتێ وەرت گرتن؟

پەح..خانم فەرمانی داوە بەخشیشم بدەنێ.. ئەگەر ئەو ئەمری کردبێ مامۆستا بۆ تەنیا پەنجا لیرەی دامێ؟

پاشان پرسیاری کرد:
-بۆ قسە ناکەی؟پارەکەت وەرگرت یانا؟ من دەزانم ڕەزیل و قرچۆکە..
هەڵساو چووە ژووری مێردی و شەڕ دەستی پێکرد.پاشان بەدووای منیان نارد، مامۆستا هەر ئەوەندەیە ناگری، گوتی:
-ئەو بەخشیشەی ئەمرم کرد بۆت سەرف بکەن کە مەبلەغی دووسەد لیرەیە وەرت نەگرت ؟
خانم چاوی زەق کردبوونەوەو دیقەتی منی دەداو بە تیکە چاوێکیش تەماشای مێردی دەکرد.
بیرم کردەوە چ بڵێم ..ئەگەر دەڵێم وەرم نەگرتووە مێردەکەی دەداتە بەر بابوج، ئەگەر بڵێم وەرم گرتووە ڕەنگە خۆم لێدان بخۆم!.
وەلاٌمی مامۆستام دایەوەو گوتم:
-گەورەم قستی یەکەمم وەرگرت کە بریتی بوو لە پەنجا لیرە، سەدوپەنجا لیرەکەی دیکەیش مانگانە بە قست وەریاندەگرم.
-بینیت ڕۆحەکەم؟ئێستا باوەڕت کرد؟
خانم رووی لەمن کردو گوتی:
-روڵە زووکە بڕۆ باقیی بە خشیشەکەت وەربگرە!!

# خەونێکی مەترسیدار

پەخشی ئێزگەی ئیستانبوولْ کۆتایی هات.کەواتا رۆژێکمان بەڕێ کردو داخیلی رۆژێکی نوێ بووین. دەبوو ئەو شەوە دوو دانە چیرۆك و وتارێك بنووسم و رای خۆم بۆ گۆڤارێك بەیان بکەم کە راپرسیی دەکا.هەروەها چاوێك بەو سێ گۆڤارانەدا بخشێنم کە ئەمڕۆ بە پۆستە گەیشتوونەتە دەستم.دەبێ موتاڵەی کتێبێکیش بکەم.کەچی لەو هەموو کارانە، تەنیا چیرۆکێکم بۆ نووسراو بێتاقەت بووم.

قەڵەم و کاغەزم لە بەردەمم دانان چیرۆکی دووەم بنووسم، بەڵام هەرچی بیرۆکەیە بە خەیاڵمدا نایە.کۆنە دەفتەرێکم کردەوە کە جاروبار بیرۆکەی چیرۆکی لێ تۆمار دەکەم، بەڵکو بەهانام دێ و بابەتی چیرۆکێکم پێ دەبەخشێ، کەچی هیچ یەك لە بابەتەکانم بەدڵ نەبوون.

هەستم بە برسێتی کرد،ئەمە حاڵی بەندەیە ،کە بابەتم نەبێ وخۆم بدزمەوە ، یا هەست بە برسیبوون دەکەم یا کڕو بێ دەنگ دەبم یا خۆم دەکوتمە ئاودەست .

وەك ئەگەر تێربخۆم رەنگە بیرۆکم بۆ بێ!چوومە ساڵۆن و ئەوەی دەنگ بێ نایەو هەموویان نوستوون.دەرگای مەتبەقم کردەوە.. برنج ساردە کێ گەرمی دەکاتەوە؟ ماسیی قوتوو پەنیرو تەماتەم خواردن و لەسەر مێز دانیشتم و کاغەز لەبەر دەممایەو سەرم خستە نێو هەردوودەستەکانم و بیرم کردەوە.لەو کاتەی کەبیرۆکەی جوان جوانم بۆ دەهاتن هەستم کرد خەو دەمباتەوە. تەماشای سەعاتم کرد کاتژمێر دە دەقیقەی دەوێ بۆ سێی بەیانی.هەروایە ئەگەر درانگ نان بخۆی خەو دەتباتەوە!

مرۆڤ لە کاتی نوستندا دەژی، بەڵام ئەو ژیانە چ سوودی هەیە؟خۆشیی ژیان لەوەدایە کە تۆ هەست دەکەی بەڕاستی دەژی!

دۆستێکم هەیە ئێستا لە بەندیخانەیە.. هەر خەوی لێ دەکەوت خەونی دەبینی.دەیگوت:

-کە خەون دەبینم هەست دەکەم تەمەنم درێژ دەبێ!

لەمانگی تشرینی یەکەمدا بووین.بەندە عادەتم بووە کردووە بەڕووتی بخەوم وپەنجەرەی ژووری نوستن بەکراوەیی جێ بهێڵم .وا هەست دەکەم ئەمشەو خەون دەبینم!

کەش و هەوا زۆر لە باربوو، زگیشم تێر.لەبەر ئەوەی نووسینەکانم تەواو نەکردبوون هەستم بە نارەحەتی دەکرد، کەواتا ئەو خەونەی ئەمشەو دەیبینم خەونێکی ترسناکە!
لەو بیرۆکانەدا بووم کەخەو بە تەواوەتی بردمیەوەو خەونێکم بینی خوا خێری بکا.
خۆم لە وولاتێکی دیکەدا بینیەوەو نەمدەزانی کوێیە.. ولاتێکە لە ئەمریکاو ئەلمانیا دەکا.بۆ ئاگاداری بەندە پێشتر نە ئەمریکام بینیوە نە ئەلمانیا،بەلام شتم لە بارەیانەوە لەو کەسانە گوێ لێبووە کە بینیویانە.خۆم لە سالۆنێکی پان وبەریندا بینیەوەو کە بانەکەی زۆر بەرز بوو.
نازانم ئێوەیش وان؟من کە خەون دەبینم دەزانم ئەوە خەونە!
لەو خەونەدا قسەم دەکرد.هەبێ و نەبێ ئەم شوێنە (کۆشکی سپی)یە.دەستیەك لەدەوری مێزێکی گەورە دانیشتوون و نەمتوانیبە هیچ شێوەیەك لێیان بپرسم(ئێرە کوێیە؟)..چونکە من بە ئەرکێکی فەرمی هاتوومەتە ئێرەو ئەگەر پرسیارە بکەم گالتەم پێدەکەن و دەلێن(کابرا نێوی ئەو شوێنەیش نازانێ والێی دانیشتووە)!
کۆبوونەوەکە کۆبوونەوی نێو دەولەتی بوو.منیش تاکە کەسم کە نوێنەرایەتی ولاتەکەی خۆم دەکەم.ئەوانی دیکە هەرهەموویان کەسانی گرنگ بوون. جل و بەرگیان رێکوپێك.یەکێکیان گوتی :
- زۆر بەخێر بێی.
- سپاست دەکەم.
- دەمانەوێ لە تۆوە وەزعی وولاتەکەتمان گوێ لێ بێ!
ترسم گەیشتێ.بەلام وەسەر خۆم نەهێنا.جا بۆ بترسم ئەی ئەمە خەون نیە؟..خەون بێ و خەون نەبێ، ئەی ئەگەر یەکێك لە برادەرانی خۆمان گوێی لە وەلامی من بێ؟ دەی ئەمە خەونە.. گوتم:
- فەرموون بەرێزان چ دەپرسن بپرسن، بە پێی زانیاریم وەلامتان دەدەمەوە.
یەکێکیان پرسیاری کرد:
- ولاتەکەی ئێوە لە ولاتە دوواکەوتووەکانە..وانیە؟
هەستم کرد شتێك لە ملم ئالاوەو دەمخنکێنێ..خوایە چ بکەم،چ بلێم؟ئەگەر دەلێم (بەلێ ولاتەکەم دوواکەوتووە)ئەوە باسی خراپەی خۆمان لەبەردەم بێگانە دەکەم و سزای ئەم قسەیە بەگوێرەی یاسای سزادان زۆر قورسە. ئەگەر بلێم نەخێر ولاتەکەم دوواکەوتوونیە ئەوە درۆ دەکەم. جا چ بلێم؟نەخێر راستی نالێم و تاوانێك ناکەم و وولاتەکەم ناشکێنم .قیری سیا درۆ دەکەم خۆ یاسا سزای درۆ نادا!

کابرای چاودێری دەکردم گوتی:

- بۆ قسە ناکەی؟

گوتم:

- ببوورە لە پرسیارەکەتان نەگەیشتم..

- ولاتەکەتان دوواکەوتووە یا نا؟

قیژاندم:

- ئەمە کێ وای گوتووە؟ئەو کەسەی ئەم قسەی کردووە راستی دەشێوێنێ..

- هەموو کەس وا دەڵێن..ئێمەیش ئەوە دەزانین..

- بەڕێزان لەبیرتان نەچێ دوژمنمان زۆرن و ئێمەیان خۆش ناوێ..هەربۆیەش ئەم درۆیانەمان بۆ هەڵدەبەستن!!

تێکڕا سەرسام بوون و دەمیان وەك ئەشکەوت والا کردن و گوتیان:

- یا!!

یەکێکی دیکە گوتی:

- کەواتا ئەو زانیارانەی لەبەر دەستی ئێمەدان هەڵەن؟

- بەڵێ هەڵەن و پرۆپاگەندن و ئامانجی ئیمپریالیزمیان لە پشتەوەیە.

یەکێکی دیکە گوتی:

- ئێستا تێگەیشتم!ئێوە گەلێکن شانازی بەخۆتانەوە دەکەن و ئەگەر بلێن (ولاتەکەتان دوواکەوتووە )تووڕە دەبن..بۆیە ئەمە دەگۆڕین و دەڵێین(دەوڵەتانی تازە پێگەیشتوو) رات چیە؟

- نەخێر ئەمە نابێ، ئێمە دەوڵەتی وا نین، ئێمە دەوڵەتی پێشکەوتووین،زۆریش پێشکەوتوو..

هەموویان لە کاردانەوەی من سەرسام بوون و لەنێوان خۆیاندا کردیانە چرپە چرپ.

- شاری بێ ئەلەکتریکتان هەیە؟

ئەگەر بلێم ئا هەیە،ئەوە لەبەر دەم بێگانە بە خراپە باسی ولاتەکەم دەکەم!

- لەتەواوی شارەکاندا کارەبا هەیە تەنانەت لە قەزاو گوندەکانیشدا..

- باشە باشە..زۆر باشە.

یەکێکی دیکە پرسیاری کرد:

- دەڵێن کارەبا لای ئێوە گرانە.. کیلۆواتی بەچەندە؟

- باسی کارەباتان کرد؟! گەورەم کیلۆوات بەلاشە. بۆ دەتانەوێ پارە بە کارەبایش بدەین؟

- زۆر باشه..زۆر زۆر باشه..
کەیفم سازبووبەوەی توانیم بە باشی لەبەردەم بێگانەدا باسی ولاّتەکەم بکەم.ئەم قسانە لە ڕۆژنامەدا بلاّودەبنەوەو برادەرانی خۆمان کەیفیان بەم پڕۆپاگەندەیە دێ!
- کرێی خانوو زۆر گرانەو قەیرانی نیشتجێبوونتان هەیە،خاوەن داهاتی سنووردار ئەگەر نیوەی مووچەیان نەدەنە کرێ ناتوانن خانوو پەیدا بکەن، وانیە؟
لە قوولاّیی ناخمەوە دنگێکم گوێ لێدەبێ کە ڕاستی بلّێم و وەلاّمی ئەو دەنگە دەدەمەوەو دەلّێم:( ئەگەر ڕاستی بلّێم عەدمم دەکەن!) دەنگەکە دەلّێ:(تۆ خەون دەبینی و ئەوان خەونەکەی تۆ نابینن و گوێشیان لە قسەکانی تۆنا بێ. ئەوان خەونی دیکە دەبینن، هەر نەبێ لە خەوندا ڕاستی بلّێ)..
لەشم یەکپارچە ئارەقە بوو، نێوچەوانم سڕیەوەو دامە قاقای پێکەنین:
- هە..هە..هە..ئەمانە واباسی ولاّتەکەمان دەکەن؟ نەخێر هیچ نالّێم و لەخوا دەپاڕێمەوە کە بە زووترین کات دوژمنانمان کوێر بکا..پاشان هاوولاّتی ئێمە وەکو هەموو هاوولاّتیانی دنیا تەنیا سەدا دەی باجی داهات دەدا!
-ئەی مووچە خۆر؟
- مووچەخۆر! مووچەخۆر چونکە ژمارەی خێزانیان زۆرە، لە خانووی پان و بەریندا دەژین! خانوو لە وولاّتەکەی ئێمەدا ئەوەندە هەرزانە تا ئەو ئەندازەی ئێمە حەز بە دانیشتن نەکەین!
- بیستوومانە خاوەن خانوو خانووەکانیان بەکرێ نادەنە ئەو خێزانانەی منداڵیان هەیە؟
-تەهـ..تەهـ..تەهـ..کوێ ئەم بوختانانەی هەڵبەستووە؟کرێچی ئەسڵەن چارەی خاوەن خانوو نابینێ. ئێمە لە هەموو شارەوانییەکاندا دەستەی کرێمان هەیەو ئەگەر پێویستیمان بە خانوو بوو سەردانی ئەو دەستەیە دەکەین. بۆ نموونە دەلّێم:(خانووێکی پێنج ژووریم دەوێ. بەمەرجێك ڕەنگیبانیوۆی شین بێ و ڕەنگی پەمەییم ناوێ چونکە ژنم حەز بەم ڕەنگە ناکا).
- بێگومان تۆ بە شێوەیەکی نایاب باس لە ولاّتەکەی خۆت دەکەی!
- دەلّێن ژیان لای ئێوە زەحمەتەو خاوەن داهاتی سنووردار لەدەستی دەنالّێنن و ژمارەی خاوەنی داهاتی ناوەنجی ڕۆژ بە دووای ڕۆژ بەرەو کەمبوون دەچن؟
- بزانە بزانە،چمان بۆ هەڵدەبەستن؟
دۆستانی ئازیز..بەر لەهەموو شت دەمەوێ ئەم ڕاستییەتان پێ بلّێم..ئێمە لە کەسمان گوێ لێ نەبووە ژیانی هاوولاّتیەکانمان زەحمەت بێ تەنیا لە ڕۆژنامە بیانییەکانەوە نەبێ! لە ڕاستیدا

ئێمه نەك هەر لەم بوارەدا بەڵكو لە هەموو بوارەکانـدا کێشـەمان نیـە. سـەبارەت بـە خـاوەن داهاتی ناوەنجییەوە ماشەڵلا هەر هەموویان لە خۆشیدا دەژین وبەر لەوەی بێمـە ئێـرە تکایـان کرد سلاوی تایبەتییان بگەیێنمە ئێوەی بەڕێز.. ئاگاتان لێ بێ هەندێ کەس لەزمانی ئەوانـەوە درۆ هەڵدەبەستن..

- بیستوومانە لای ئێوە ئاستی بێکاری بەرزەو مەرجی ژیان زەحمەتە بەتایبەتی سـەبارەت بـە کرێکارانەوەو دەست هەقیان لەژێر هێلی سوورەوەیە؟لە روویان تەقیمەوەو گوتم:

- ئێوە باوەڕ بەمن دەکەن یا بە تێکدەران و دوژمنانی ئێمە؟

- نەخێر باوەڕ بە تۆ دەکەین..

- باشە گوێ بگرن..کە ئێوە باس لە کرێکارانی ئێمـە دەکـەن ، ئەمـەیش روونکردنـەوە: ئـەو کرێکارانە لەو پەڕی خۆشیدا دەژین، تێگەیشتن؟ رۆژێکیش چیە گلەیان لە هیچ نەکردووەو ئـەو دەست هەقەی ئەوان وەری دەگرن هیچ کرێکارێکی دیکە وەریناگرێ. لەمـەیش زیـاتر دەتـوانم بەبەڕێزتان بڵێم کە ئەو پارەیەی کرێکاری ئێمە سالأنە پاشەکەوتی دەکـا بەشـی دروسـتکردنی کارخانەیەك دەکا ؟،بەلاًم ئەمە ناکا چونکە چاوی تێرە..

- وەی..وەی.. ئەوە چ وولاًتێکە؟

ئەگەر ئاژانسی دەنگوباسی ئەنادۆڵ ئەم قسانەی من دەگەڵ بێگانەی دەکەم بلاًوبکاتەوە، دەڵـێ چۆن ئەم هەموو شتانە دەربارەی ولاًت دەزانێ؟ئەو کاتە درۆکانم بە فیڕۆ ناچن.

- ئەی حالًی پەروەردە چۆنە؟ زانیومانە راژەی نەخوێندەواری لە سەدا هەشتایە؟

- پف..درۆیـان کردووە..ئەگـەر درۆ کلکـی هـەبێ ئەوانـە کلکدارن..ئەوەنـدە خوێنـەوار لـە وولاًتەکەی ئێمەدا هەن خەرێکە خەڵکەکە لە نووسین و خوێندنەوە بێزار دەبن.

بۆ دەرمانیش نەخوێندەوارێك لە وولاًتی ئێمەدا نادۆزیـەوەو رادەی هـەر خوێنـدەوارێکی ئێمـە بەقەد سێکەسانە.ئەوەندە خوێندنگەمان هەن دەوڵەت  کە شەقامێك دروست دەکا ناچار دەبێ بیانروخێنێ. سەبارەت بە مامۆستاش ئەوەندە زۆرن  بە هیچ شێوەیەك ژمارەیان نازاندرێ..هەر دەست هەڵبڕە بە دەموچاوی پەنجا مامۆسـتا دەکەوێ.هـەر چـەندەی دارکاریـان بکـەی،فڕەیان بدەی، بیانرژێنیەوە ناتوانێ رەگیان لە ڕیشەوە هەڵتەکێنی و تەواویان بکەی.

یەکێك لە شوێنی خۆیەوە هەڵبەزی و گوتی:

- ئەمە راست نیە..ئێمە هەمیشە ئەو وتارانەی تۆ دەخوێنینەوە کە رۆژانـە لـە رۆژنامەکانـدا بلاًویان دەکەیتەوەو هەر هەمووشیان باسی کەمیی قوتابخانەو مامۆستا دەکەن!

- جا ئێوە باوەڕتان بەو قسانە کردووە؟باوەڕتان کـردووە وانیـە؟ مـن ئەمـە دەنووسـم چـونکە موعارەزەم.گەلی ئێمە تاسەر ئێسقانی موعارەزەیە.بۆیە من کە بابەتێك دەنووسـم راسـتیەکە نالێم بەڵکو ئەوە دەڵێم کە موعارەزە پێی خۆشە.بۆ نموونە دەڵـێین قوتابخانـە نیـە، بـۆ ئـەوەی رۆژنامە بفرۆشرێ!

ئەمە حاڵی راگەیاندنی ناوخۆییمانە، بەڵام راگەیاندنی دەرەوە ترسی لەسەر نیە!

- رێگەوبانتان کەمن،ئەوانەی هەشن تێکچوونە؟

زۆر تووڕە بووم و هەڵسامە سەر پێ و گوتم:

- بەس بێ..بەس.. من دەڕۆم!

- بۆکوێ؟ تۆ ناتوانی بڕۆی چونکە خەون دەبینی..

کەواتا دەزانن خەونە!

- واز بێنن با بڕۆم.

- بۆ کوێ؟

- ئەڕۆمەوە ولاتەکەی خۆم..

بەرەو دەرگا هەنگاوم نا تێکڕا هەڵسانە سەرپێ ومنیان لە گۆشەیەکدا عاسی کرد:

- وازم لێ بێنن..

- تۆ خەون دەبینی و ناتوانی بڕۆی.

رەنگە ئێوە هەمووتان خەونی پڕ لە ترستان بینیبێ! ئەگـەر بتانـەوێ رابکـەن نـاتوانن چـونکە قاچتان ناجوولێتەوەو ئەگەر هاوار بکەن دەنگتان دەرناچێ..منیش ئاوام بەسەرهات.

ئەوکاتە یەکێکیان گوتی:

- هێشتا پرسیارێکمان ماوە، ئازادیتان هەیە یا نا؟

لـەدڵی خۆمـدا دەمگـوت کـورە مەترسـە ئەمـە خەونە..بـەڵام خـۆ بەدەسـت مـن نیـە، دەترسم.لەهەمان کاتیشدا دەمگوت: ئیشاڵلا خەونە..

قیژاندیان:

- قسە بکە، بڵێ بزانین ئازادیتان هەیە؟

دووا جار گوێیان لێم بوو بە دەنگێکی بچڕ بچڕ دەمگوت:

- هەیە.. زۆریش هەیە.. پڕیەتی لە ئازادی..

- ئازادیتان هەیە؟

- باسی کام ئازادی دەکەی؟
- ئازادیی رۆژنامە گەریتان هەیە؟
- بێگومان برالە هەمانە..هەموو شتێکمان هەیە..هەموو جۆرە ئازادیمان هەن و ئازادیی رۆژنامەوانیشمان هەیە..زۆرمان هەیە. بەرم دەن.
- ئازادیی رۆژنامەوانیتان هەیە؟
- ئەی نەمگوت هەمانە..بەڵێ هەمانە.
- باشە چۆن ئازادیی رۆژنامەوانیتان هەیە لە کاتێکدا کە هێشتا یاسای کۆنی چاپەمەنی جێبەجێ دەکرێ؟
بە غەیری فڕین نەبێ هیچ رێگە چارەیەکم نیە .زۆر جار خەڵك لە خەونیاندا دەفڕن.قۆل وباسکم وەك دوو جووتە باڵ کردنەوە،بەلاّم هەستم کرد قاچەکانم قورسن و وەعاردی نووساون.ئەگەر قاچەکانم بەرز دەبوونەوە ئەوە وەك چۆلەکە بە ئاسماندا دەفڕیم، رەنگە خەتای ئەو ژەمە بێ کە پێش نووستن خواردم!زۆرم هەوڵدا نەمتوانی بفڕم.
- قسە بکە هێشتا یاسای کۆنی رۆژنامەگەری جێبەجێ دەکرێ ؟
- بۆچی دەڕواننە یاسای کۆنی چاپەمەنی کە هێشتا ماوە؟ بەڵێ ماوە بەلاّم جێبەجێ ناکرێ! ئێمە ئەو تۆپانەمان پاراستوون کە سوڵتان محەمەد فاتیح ئیستانبوولی پێ رزگارکردوون و بەکاریان ناهێنین، باشە لەناویان بەرین؟ ئێمە یاساکانی نا دیموکراتی تورِ نادەین و بۆ ئەوەی هەمیشە لەبەر چاومان بن و پەندیان لێ وەربگرین و لەبیرمان بێ کە چەند بەدەستیانەوە نالاّندوومانە.پاشان ئێمە ئەوەندە ئازادیی رۆژنامەوانیمان هەیە لەدەستیان داماوین و نازانین چییان لێ بکەین!
- باری ئابووریتان زۆر خراوە،بودجەتان پڕیەتی لە کەم و کەسری،تۆ چ دەڵێی؟
- دەڵێم هەلاّ هەلاّ..دەتانەوێ چ بڵێم؟
لە ئارەقەدا غەرق ببووم . هاوارم کرد:
- خەون بەس نەبێ؟ بەئاگا نەیەمەوە؟
- ئەگەر راستی نەبێژی قەت لەم خەونە وەئاگا نابیەوە.
ئەگەر راستی بڵێم پرۆپاگەندەیە دژ بە وولاّتەکەم.خوایە ئەم بەلاّیە چیە؟
- باری ئابووریمان وانیە کە ئێوە دەیزانن.زۆر گەشەی کرووەو بودجەمان فیتە.
دەمویست زیاتر چنە لێ بدەم نەیانهێشت:

- ئەگەر وابێ ئێوە پێویستیتان بە کۆمەك و یارمەتی نیە.تۆمان هێنایە ئێرە تا راستیەکەمان پێ بڵێی و ئەگەر پێویست بێ قەرزتان بدەینێ.بەلاّم کە کاروبارتان رێکوپێکە واتا پێویستیتان بە کومەکی ئێمە نیە.فەرموو خوات لە گەڵ.

-بو؟

پەح من نوێنەری ولاٰتم هاتووم داوای یارمەتی بکەم!

- باشە بۆ لە هەوەڵەوە واتان نەگوت؟ئەو کاتە دەمزانی چ بڵێم!

- فەرموو خوا حافیزت بێ.

لەترسان دەگریام،بزانە چۆن ئەم هەلەم لە کیس چوو؟

هێشتا شەو بوو کە وەئاگا هاتمەوە.گلۆپم داگیرساندو لەسەر مێز دانیشتم و فرمێسکم سڕینەوەودەستم کردە خەون نووسینەوە..کەی بەیانی دەبێتەوە؟

لە راستیدا درێژترین شەوی تەمەنم بەسەر برد..!

# دەمەتەقێی نۆرماڵ

ئەو دوو زاتە دەبینن وا لە بەرامبەری ئێمە دانیشتوون و وەك شەڕ بكەن قسە لەگەڵ یەكتر دەكەن؟ بەڵێ..لەوە دەچێ لێك حاڵی نەبن و لەنێوانیاندا جیاوازییەكی تەواو هەبێ..ئەمە لە دەموچاوی كرژو جوولەی دەستیانەوە دیارە. ئەگەر حەز بكەن دەتوانم هۆی ئەم هەرایەتان بۆ بەیان بكەم!

یەك لەو دوو كەسانە وا چاویلكەیەكی جام ئەستووری لە چاوە ، باسی (موختار)ی نووسەری بەناوبانگ دەكاو دەڵێ بابایەكی‌نەفامەو نەئایینی هەیە نەشەرەف و نە ئەخلاق.ئەوەی تر كە لووتی هەر لە لووتی تەگە دەچێ، پەسنی (موختار)ی نووسەری بەناوبانگ دەكاو دەڵێ نووسەرێكی تێگەیشتووەو ئەگەر وادە بدا دەیگەیێنێە جێ و لۆمەی (باهیر)ی نووسەر دەكاو دەڵێ بابایەكی جاهیل و دووڕووەو بەدرۆو دەڵەسە خۆی هەڵدەكێشێ.

واتا ئەو دوو كەسەی وا دەیانبینن و یەكیان چاویلكەیەكی شووشە ئەستووری لە چاوەو دووەمیان لووتی لە هی تەگە دەكا، باس لە هەردوو نووسەری ناودار(موختار) و(باهیر)دەكەن و خەریكە باسەكەیان شەڕو گێچەڵ و تێهەڵدانی لێ دەكەوێتەوە.

بەروخسەتی خۆتان با هۆی راستەقینەی ئەم دەمەقاڵێیەتان بۆباس بكەم:

نووسەری ناودار (موختار)لە ژێرناونیشانی(بەیانی..بەیانی)وتاری سیاسی لە رۆژنامەی( رێگەی راست)دا بلاۆدەكاتەوە.(باهیر)ی نووسەریش وتاری سیاسی لە ژێر ناونیشانی(بەمە چ بلێین؟) لە رۆژنامەی (دووا هەواڵ) دا بلاۆدەكاتەوە.

یەك لەو دوو كەسەی بەرامبەرمان دانیشتوون ( ئەوەی لووتی لە هی تەگە دەكا) ماوەی چەند ساڵە خوێنەری رۆژنامەی( رێگەی راست)ـە.ئەم رۆژنامەیە لە گۆشەی ( واز لە هەموو شت بێنەو بەختت بخوێنەوە)دا هەواڵی بەخت و تاڵح و شانس بلاۆدەكاتەوە.

كابرای(خاوەن چاویلكەی شووشە ئەستوور)یش لەیەك رۆژنامە بترازێ توانای كڕینی نیەو چەند ساڵە تەنیا رۆژنامەی(دووا هەواڵ) دەكڕێ ،بەو پێیەی وشەی تێكهەڵكێشراوی لە هی رۆژنامەكانی دیكە ئاسانترەو رۆژنامە لایەنگری تیپی (فەنەر باخچە)یەو كابرایش هەر لە هەرەتی منداڵییەوە لایەنگری ئەو تیپەیەو مامی خوالێخۆشبوویشی هەر وا بوو.

شەوێکیان(موختار)ی نووسەری بەناوبانگ تا سپێدەی بەیان لەگەڵ دۆستێکی ئارەق دەنۆشێ و بەیانی کە لە خەو هەڵدەستێ هیچ بیرۆکەی بۆ نایە بینووسێ. بەلاَم چونکە زیرەك و بەتوانایە هەر بیرۆکەیەکی دەستی بداتێ هەندێ فەلسەفەی تێکەلاَو دەکا و ئامانجی دەپێکێ، وتارێکی بەناونیشانی( سوودی فاسۆلیای وشککرایەو خراپەی نیسك) بلاَوکردەوەو وا دەستی پێکرد:

دنیای رۆژئاوای هاوچەرخ لە کانیاوی رۆژهەلاَتەوە سەرچاوەی گرتووەو سوودیان لە کتێبی(چاکەی فاسۆلیای وشك)ی زانای مەزن(ئیبنولمەرتەبانی)

وەرگرتووە.. ئیدی زۆر وەستایانە باس لە فاسۆلیا دەکا زانیاریی زۆر ورد لە بارەیەوە دەنووسێ.لە راستیشدا نە کتێبێك بە ناو(چاکەی فاسۆلیای وشك) هەیەو نە زانایەکیش بە نێوی(ئیبنولمەرتەبانی) . کەچی موختاری نووسەری بەناوبانگ توانی بەو وتارە جوانەی سەرەنجی خوێنەران رابکێشێ .

لەوکاتەی ئەو وتارە لە رۆژنامەی( رێگەی راست)دا بلاَوبۆوە، باهیری نووسەر خاوەنی گۆشەی (بەمە چ بڵێین؟) دووچاری گرفت دەبێ،بەهۆی ئەو خوانەی دۆستێکی شەوی پێشوو بۆی رێك دەخاو تا سپێدەی بەیان خەو ناچێتە چاویەوەو ئەوەی بیرۆکەیە ئەو رۆژە بۆی نایە بیکاتە نێوئاخنی وتارییەوە. لەوکاتەی رۆژنامەی رێگەی ڕاستی هەڵگێڕو وەرگێڕ دەکرد چاوی بە وتاری موختار دەکەوێ و هەوڵ دەدا شتێکی لێ بخوێنێتەوە، بەلاَم یا تێیناگا یانیش بێتاقەت و خەواڵوو، بیردەکاتەوە:ئەوە ماوەی دوو حەفتەیە شەڕە قەڵەمی لەگەڵ کەسدا نەکردووە چونە ئەگەر شەڕێك بە موختار بفرۆشێ؟ ئاخر باهیر رۆژنامەنووسێکی بەهرەمەندو قەڵەم بەبڕشت و زۆربەی هەرە زۆری خوێنەرەکانی بە وتارکانی سەرسامن و دەمێکە حەز لە موختار ناکاو خۆشی ناوێ‌و بەدووای هەلێکەوە بوو ریسوای بکا. قەڵەمی دەرهێناو دەستی بە نووسین کرد:

(وتاری نووسەری مەزن و هاوکاری خۆشەویستم موختار لە رۆژنامەی رێگەی راست دا خوێندەوەو لە بڕگەیەکیدا باسی لە جۆرێك ئاژەڵی دەریا دەکا بە نێوی(ئەستێریدیا)و دەڵێ ئەم زیندەوەرەی دەریا لە ژێر فەرمانی مێینەدا دەژی..ئەم مرۆڤە کە ئەمەی نووسیوە هەڵەیەکی گەورەی کردووە. نووسیویەتی دەڵێ ئەم گیانلەبەرانە بەکۆمەڵ دژین و هەر کۆمەڵێك لە چل تا پەنجا پێکهاتووە .لەڕاستیدا وتاری مامۆستا مایەی گاڵتەجاڕییە، نەك هەر لەلایەن ئێمەی بەنی بەشەرەوە بگرە لەلای خودی ئەستێریداو هەمووگیانلەبەرو ئاژەڵە دەریاییەکانەوە! چونکە شتێکی زۆر سروشتییە ئەگەر لەناوچەی ئەستێریادا گیانلەبەری تاك رەگەز بژی‌و هیچ جیاوازییەك لە نێوان نێرو مێدا نیە.مێیینەی ئەو گیانلەبەرە دەتوانێ وەك نێرخۆی ئاوس بکاو

پاشان بگەڕێتەوە سەر ئەسڵی ڕەگەزی مێیینەی .نووسەری بەڕێزمان ئەم زانیارییە سادانە نازانێ کەچی خوێنەرانی دەرس دەداو باسی ئازادی و مافی مرۆڤیان بۆدەکا.نووسەری وا چۆن خوێنەرانی قەناعەت پێدێنێ؟ ئێمە قسە ناکەین و با خوێنەرە خۆشەویستکانمان دادوەر بن).
خوێنەرانی ڕۆژنامەی دوواهەواڵ هەقیان دایە ڕەخنەکانی مامۆستا باهیر،چونکە وتاری دوێنێی موختاری روژنامە نووسیان نەدیبوو.
موختار کە وتار دەخوێنێتەوە ئەوەندەی نامێنێ شێت بێ. قەڵەم دەگرێتە دەست و هێرشێکی وا دەکا تاکی نەبێ و تەنانەت باسی گیانلەبەریش ناکاو وتارێك بە نێوی( بەری خۆر مەگرن) دەنووسێ و دەڵێ:
(دوێنێ یەك لە نووسەرەکانی پارچە کاغەزی ناونراو بە (دووا هەواڵ) وتارێکی بلاۆکردووتەوە کە هەر لە هوڕێنە دەکاو دەڵێ: ساڵی ١٨٤٨لە کاتی شۆڕشی بڕوسیاو لە بەرەنگاربوونەوەی سپای شکسپێردا کریستوف کۆلۆمبس مردووە.لەیەکێ لە نووسینەکانیدا هاتووە(ئەی ئازادی ئای کە جوانی)واتا ئازادی خۆراکی ئەقڵە وەك چۆن نان خۆراکی زگەو موزیك خۆراکی رۆح).
(وتاری وا پڕ لە هەڵە چۆن راستکەمەوە؟ بەندە پێموایە هەرچی بکەم بێ سوودە ، نووسەرێك کە شەرەفی وشەو بیر نەپارێزێ.ئەمسالی ئەمانە فێرە مشتخۆریو قاپ لێسینەوە بووینەو شەڕ بە کەڵە پیاوی ئەم چەرخە دەفرۆشن.منیش بەڕاشکاوی پێتان دەڵێم کە ئێوە قەتاو قەت ناتوانن بەری تیشکی خۆر بگرن وروناکیی راستی هەمیشە درەوشاوەیە).
خوێنەرانی وتاری موختاری رۆژنامەنووس سەیریان بە جەهالەتی باهیری رۆژنامەنووس هات.باهیریش ئەم ئیهانەیەی قەبووڵ نەکردو رۆژی دوواتر لە هەمان گۆشەی(بەمە چ بڵێین؟)دا وتارێکی لەو ژێرناونیشانی(دەك شەرمەزاربن) بلاۆکردەوە:
( ئەم موختارە زۆڵەی خۆهەڵکێش کە لە رۆژنامەی رێگەی راست دا دەنووسێ. دەیەوێ راستییەکان زیند بەچاڵ بکا. کە نەیتوانی لەسەر بنچینەی زانست وەڵام بداتەوە هەوڵی داوە مەسەلەکە بکاتە شتێکی شەخسی،بۆ ئاگاداریتان تەنانەت ناتوانێ کار لە قاچیشم بکا، چونکە ئەوەی دەیلێ پوختان و درۆو دەڵەسەیەو کەس باوەڕی پێ ناکا. ئێمە چاکی دەناسین، ئەو نەبوو جلشۆری لەماڵی شاعیری گەورە خوالێخۆشبوو سلێمان خستە ژێر پاڵتۆو دزی؟ ئەو کەسەی بەم قسەیە باوەڕناکا با لە پیاوی بەشەرەف خوالێخۆشبوو نەزمی بەگ
پرسیاربکا کە ماوەیەکی دوورودرێژ بەڕێوەبەری پۆلیس بووە. هەروەها رۆمانی (نافوورەی شاخ)ی لە جان پۆڵ بییێر دزیوە.ئێمە تەنیا ئەو رووداوە دەگێڕینەوەو بۆ دوواجار هۆشیاریی

دەدەینێ گە ئەگەر واز لەو بوختانانەی نەهێنێ ، ناچاردەبین هەرچی گووکاری ئەوە بلاوبکەینەوەو ئەگەر هەر وازی نەهێنا ئەوە دادگا هەیە)!

خوێنەرانی رۆژنامەی( دوواهەواڵ ) موختاری رۆژنامەنووسیان بە پیاوێکی چەپەڵ دانـاو ڕقیان لێی بۆوە.

بەیانیی رۆژی دوواتر، لە گۆشەی( بەیانی..بەیانی)دا کە موختاری رۆژنامەنوس دەینووسێ،رۆژنامەی(رێگەی راست) لە ژێرناونیشانی:( ماکینەی درۆ قور فـڕە دەدا) ئەمەی بلاوکردەوە:

ئەو رۆژنامەیەی پێی دەڵێن(دووا هەواڵ) لە گۆشەی(چ بەمە بڵێین؟) نووسینێکی بەقەڵەمی نووسەری بە کرێگیراو(باهیر) بلاوکردووتەوە.ئەو کەسە رێگەی چەوتی گرتووە و لە سەر داهاتی نا دیار دەژی.چۆن دەتوانێ لەفەرەنسییەوە وەرگێڕان بکا لە کاتێکدا کەحەشتەبای زمانی فەرەنسی نازانێ؟جارێکیان چەند وشەیەکی فەرەنسی ورگێڕابوو ئابڕووی دەقەکەی بردبوو،لەکاتێکدا کە قوتابی قۆناغی ئامادەیی لەو باشتر دەتوانن وەریگێڕن. دەبوو ئەو نەفامە داوای کۆمەك لە دۆست بـرادەران بکا. ئێمە نامانەوێ کێشەی زانستی بکەینە کێشەی شەخسی،هەرچەندەی دەزانین کە ئەم رۆژنامەنووسە رێگرە خەڵکی شاری ئازەربێجانەو باوکی دوکانی بەقاڵیی هەیەو شارەوانی سزای قورسی داوە لەبەر ئەوەی رۆنی خەشی فرۆشتووە.. ئەم رۆژنامەنووسە فێڵبازە لە ئەوروپاوە ماکینەیەکی تەراشی کارەبایی دێنێ و باجی گومرك نادا،هەروەها هەندێ شتی قاچاغیشی لە باوڵدا بووە.. زۆر شتی دیکە هەن بەلام شەرەفی پیشەی رۆژنامەنووسی رێگەم نادا هەموویان ئاشکرا بکەم..)

بەڕاشکاوی و بێ پەردە موختاری رۆژنامەنووس هەقیقەتی باهیری رۆژناموسی بۆ خوێنەران ئاشکرا کرد کە چەند پیاوێکی بەدفەڕو خراپە، هەرچەندەی باهیر خەڵکی شاری ئازەربێجان نیە،بەلام خوێنەرانی شاری ئازەربێجانی رۆژنامەی رێگەی راست داوایان کرد نازناوی ئازەربێجانی لێ بسێنرێتەوە.

پاشان باهیر ئەم ولامەی دایەوە:

(دەمەوێ حکومەت ئاگاداربکەمەوە کە چەپڕەوێك خەریکە دەلوورێنێ.. ئاگاتان لە مەترسی بێ..لەکاتێکدا کە وولاتەکەمان بەرەنگاری بیری زیانبەخش دەدا، قەڵەمە چەپڕەوەکان لەپەنای شێوەو قالبی جۆراوجۆردا بەردەوامن لە هاندانی گەل و ژەهراویکردنی بیروڕای..ئەم شێوە نەفرەت لێکراوانە دابونەریتی وولات تێکوپێك دەدەن تا زەمینە بۆ فرت و فێڵی ئەو گرووپانە

خۆش بکەن. لەوانە خاوەنی قەڵەمی چەپەڵ، ئەوەی لە لاپەڕە زەردهەڵگەڕاوەکەی ناونراو بە ڕێگەی ڕاست دا دەنووسێ و هێرشی کردووتە سەر من بەلاّم ئەمجارەیش سەری دای لەبەردو ناچاری کردین هەقیقەتی ئاشکرا بکەین..)

وتار بەم جۆرە هێرشانەوە بەردوام بوون ، تا دادوەری گشتی بەمەی زانیو وتارەکانی موختاری ڕۆژنامەنووسی خستنە ژێر چاودێری.

پاشان موختار لە ژێرناونیشانی( هشت) وەلاّمی وتارێکی دایەوەو گوتی چیتر لەمەو دووا وەلاّم ناداتەوە.

ئەوەبوو باهیری ڕۆژنامەنووسیش لە ژێر ناونیشانی( وەلبە) وەلاّمی ئەم وتارەی دایەوەو دووا وەلاّم بوو.

ئەمە هۆی ئەوەیە کەئەم دووکەسەی وا لە بەرامبەرماندا دانیشتوون مشتومڕیانە..یەکیان لووتی لە لووتی تەگە دەکاو دووەمیان چاویلکەی شووشە ئەستووری لە چاوە.یەکێکیان تەنیا ڕۆژنامەی ڕێگەی ڕاست دەخوێنێتەوەو ئەوی تریان تەنیا ڕوژنامەی دووا هەواڵ..هەر بۆیەش ناتوانن ڕێك کەون!!

من وەزعەکە باشتر دەزانم چونکە هەموو وتارەکانم خوێندوونەتەوەو ئاگاداری شەڕە قەڵەمی نێوانیان بووم. شتێکی دیکەیش دەزانم: لەوکاتەی ئەم دوو کەسە مشتومڕیان بوو ، خەریك بوون بە هۆی ئەو دوو ڕۆژنامەنووسەوە سەرو گوێلاکی یەکتر بشکێنن، هەردوو ڕۆژنامەنووس (موخنتر)و(باهیر) لەتەك یەکتردا لەسەر خوانی سەرەك وەزیران دانیشبوون و قاقای پێکەنینیان سەدە جووتێك دەنگی دەدایەوە. چونکە هەردووکیان مانای ئازادیی دەربڕین دەزانن، بۆیە ڕێزی یەکتر دەگرن ئەگەرچی بیروڕاشیان جیاواز بێ، ئاخر هەردووکیان ڕۆژنامەنووسی شارستانین!.

# عەزیز نەســـین لووتكەی داهێنان و هەڵوێستی جوامێرانە(*)

## (١٩١٥-١٩٩٥)

پێموانیە نووسەرێكی دیكەی تورك( نازم حیكمـەت(١) و یەشـار كـەماڵی(٢) لێدەرچـن) بەقـەد عـەزیز نەسین لای خوێنەری كورد ناسراو بێ و شوێنی خۆی كردبێتەوە،هەرچەندە بەرهەمـەكانی كەمیان كراونەتە كوردی(٣).

من وای بۆ دەچم كـە هـۆی ئـەم نزیكبوونەوەیـە بـۆ شـێوەی تایبـەتیی نووسـینەكانی نەسـین بگەڕێتەوە، كە ناوەرۆكیان لە جەرگەی كۆمەڵ

هەڵقوڵاون و رەنگدانەوەی واقیعی ژیانیەتی بە تاڵ و سوێرو شیرینیەوە.

كە كوردێك بەرهەمی نەسین دەخوێنێتەوە بەهیچ شێوەیەك هەست بە نامۆیی ناكات و ئەوەندە بیرماندووكردنی گەرگ نیە تا لە مەبەستی بگا. قارەمانەكانی چیرۆك و رۆمانەكانی (پـۆلیس، فەرمانبەری دەوڵەت،بەڵێندەر،بێكار، ساختەچی و قۆڵبڕ،سادەو سـاكار..)خەڵكێكن خوێنـەری كورد دەیانناسێ و لە زمانیان دەگا.

لە حەفتاكانی سەدەی رابردوواو لە كوڵانەیەكی تەنگەوە عـەزیز نەسـین لـە خوێنـەری كـوردی باشوور وەژووركەوت ، دووای ئەوەی یەكـدوو چـیرۆكی كـورتی لـە زمـانی فارسـییەوە (نـەك توركی )كرانە كـوردی و یەكســەر شــوورەتی پەیـداكرد ، هەرچــەندەی وەرگێــڕە ئێرانیــەكان-لــەدەورانی شــادا-بەئەمانەتــەوە دەســتیان نەدایــە بەرهەمــەكانی ئــەوو بەپێچــەوانەوە گــەلێ شێواندنیان تێداكرد. لەم بارەیەوە نەسین دەڵێ:( لـە توركیـادا شەسـت و حـەوت كتێـبم چـاپ كردووە، كەچـی ئێرانیـەكان حـەفتا كتـێبی منیـان وەرگێـڕاوە).. كـە داواوی روونكردنـەوەی لێدەكەی بە پێكەنینەوە وەڵامت دەداتەوە:(ئەوان چاوەڕوانی مـن ناكـەن زنجـیرەی رۆمـانی لـە گۆڤار یا رۆژنامەدا بڵاودەكەمەوە، كۆتایی پێ بێنم و یەكسەر دەیكەنە كتێب).

ژمارەیەك وەرگێڕی ئێرانی بە بەرهەمەكانی عەزیز نەسینەوە شوورەتیان پەیـدا كرد،ئەگەرچـی كارەكانی زۆربەیان ساكارو بێ بایەخ بوون(وەرگێڕانی نا ئەمین و شـێوەی درچـوونی كتێـب لـە رووی فۆرمەوە)بەڵام چونكە خوێنەری زۆربوون ئەو لاوازییە پشتگوێ دەخرا.

بەیانیی رۆژێکی هەینی نیوەڕاستی مانگی گوڵانی ساڵی ١٩٩٠بەرەو شارۆچکەی (چاتاڵجا) کە دەکەوێتە دەوروبەری ئیستانبووڵ و، وەقفی نەسینی لێیەو چەند منداڵێکی هەتیوی بێ دایك و باوك بە خێودەکا بەڕێکەوتم.پێشتر رۆمانی(برایم زەبۆك)و کۆمەڵە چیرۆکی( فس فس پاڵەوان)م بەچاپ گەیاندبوو کە هەردووکیان هی عەزیز نەسینن و بە هۆی ئەدیبی تورکمانی دۆستم( نەسرەت مەردان)ـەوە کەناسیاوی لەگەڵدا هەبوو لەوکاتەوە کە لە بالیوۆزخانەی عێراق لە ئەنقەرەدا کاری دەکرد، دانەیەکم لە هەردووکیان بۆ ڕەوانە کردبوو(٤).
بەرلەوەی سواری پاس بم دۆستێکی عێراقی نیشتەجێی تورکیا کەبەر لەدوو رۆژان بەهۆی دۆستیکی دیکەوە ناسیاوبمان پەیداکرد، کۆمەڵێ ئامۆژگاری کردم.(کاك عەلی) کە لە گەڵ دووبرای دیکەی نووسینگەی گۆڕینەوەی دراویان بەڕێوە دەبرد،باسی لە مەترسی گەڕان و سووڕانی بێگانەی کردو چۆن دەبنە قوربانیی پیاوی ساختەچی و قوڵبڕو فێڵیان لێ دەکرێ و پارەو پاسپۆرتیان دەدزرێ. گوتی: ئەگەر هەر بڕیارت داوە بچیتە (چاتاڵجا)لەرێگەدا نەفەرێك خواردن و نۆشینی پێشکەش کردی وەریان مەگرە، چونکە دوورنیە دەرمانی بێهۆشییان تێدابێ و خۆت لە خەڵکی دووربگرەو تێکەڵیان مەبە.
ئەو باسی کردەوەی فێڵبازو ساختەچییانی دەکرد، منیش نێوەرۆکی چیرۆکێکی نەسینم وەبیر دەهاتەوە..کوڕە دەیەوێ لە گوندەوە بۆ کار بچێتە ئیستانبووڵ، باوکی لێی دەقیژێنێ : چی چی؟ گەرەکتە بچیتە ئیستانبووڵ؟ شێت بووی؟ رۆڵەی شیرینم بڕۆ هیندستان بڕۆ سیندستان بەڵام مەچۆرە ئیستانبووڵ.. ڕۆڵەگیان ئەو ئیستانبووڵیانە دەرپێت لەپێ دادەکەنن ئاگات لێ نابێ! پاشان بەسەر هاتێکی خۆی بۆ کوڕە دەگێڕێتەوە کەبەر لە بیست ساڵ هەڵە دەکا و هەندێ گاو گوێلەکە دەباتە بازاڕی ئەوێ و چۆن فێڵی لێ دەکەن و دەست لە گونان درێژتر دەگەڕێتەوە.
ئەوەی راستی بێ هیچی وا تووشی من نەبوو.کە پاس لە ناوچەی (بایەزید)ـەوە بەڕی کەوت نیمچە بەتاڵ بوو، دەیان جاریش لە رێگەدا وەستا نەفەر سواردەبوون و دادەبەزین و لە شانسی خۆمەوە تا گەیشتمە جێێ مەبەست کەس لەتەکمەوە دانەنیشت.پاشان کە بۆ نەسینم گێڕایەوە لەئیستانبووڵەوە تا چاتاڵجا ( دەیان کیلۆمیترە )مەبلەغی هەزاروسەت لیرەیان لێ سەندووم ،کەچی لە نێوبازاڕی چاتاڵجاوە تا دەزگاکەی ئەو ، کاکەی شۆفێری تاکسی چوارهەزار لیرەی ورگرت، گەلێ پێکەنی.
لەو دیدارەدا باسی زۆرشتمان کرد(بە پێویستی نازانم دووبارەیان بکەمەوە) بەڵام لەوەدەچوو گەلێ لە دەزکاکانی بڵاوکردنەوی عەرەب بێزارو تووڕە بێ(بەتایبەتی کوێتی) کە شتی ئەو چاپ

دەکەن و یەك قڕانیشی نادەنێ بەپێچەوانەی ئەورپییەکان و بەرەی سۆشیالیزم کە پێشەکی رەزامەندی وەردەگرن و مافی وەرگێڕانی بۆ رەوانە دەکەن. دەیگوت لە کونگرەی داهاتووی نووسەرانی ئاسیاو ئەفریقادا شکات دەکەم. پرسیارم لێ نەکرد ئایا لە ئێمەیش نارازییە؟ چونکە ئاگاداری نێوەرۆکی نامەیەك بووم بۆ کاك (نەسرەت)ی رەوانە کردبوو، مافی ئەوەی دابووینێ بەخۆڕایی هەرچی بەرهەمی ئەوە بکەینە کوردی و هیچی ناوێ. بۆ؟ نووسیبووی: چونکە دەوڵەتیان نیە!

## عەزیز نەسین کێیە؟

نووسەرێکە وولاتەکەی خۆی و جیهانی پتر لە نیو سەدە مەشغووڵ کردووە، ئەوەندەی چیرۆك و رۆمان و شیعر و شانۆنامەی بلاوکردووتەوە کە ئەگەر لەسەر یەك دابنەدرێن لە بالای خۆی بەرزترە: (بەرهەمەکانم لە بالام بەرزترن، کەچی هەندێ ناحەز هەن دەڵێن عەزیز نەسین خۆی کورتە بالایە).
گاڵتەجارێکە بە مەلا مەشووری دووەم (خەواجە نەسرەددین) دادەنرێ.. گەورە بەرپرسانی ترك ئامۆژگاری یەکتر دەکەن و دەڵێن: پیاوی چاك بن با عەزیز نەسین بەم مەسەلەیە نەزانێ ئەگینا دەیکاتە چیرۆك و ئابڕوومان دەبا..خوێنەرانی سەر بە دەزگا سیخوڕی یەکان و ئاسایش و پەرلەمانتارن، کەچی لە هەموو دەورانی حوکمڕانیدا لە گرتن و راونان رزگاری نەبووە:
(عەزیز نەسین کەسایەتییەکی ئەدەبی یە مێژووی ئەدەب شانازی پێوە دەکاو لە نێو سێ چینی کۆمەڵدا خۆشەویستە،خێزانی خۆی و گەلی ترك بە هەمووچینەکانیەوەو پیاوانی دەزگا سیخوڕییەکان)[٥]
تەنانەت کە خەلاتی(دارخورمای زێڕین)یشی( لەیەکێ لە پێشبڕکی نێودەوڵەتییەکاندا پێ بڕابوو) پێشکەشی سپا کرد،یەکەم قوربانی کۆدەتا سەربازییەکەی ٢٧ی گولانی ١٩٦٠ بوو. دووای گەڕانەوەی لە بەشداری کردنی یادی سەدساڵەی لەدایکبوونی نووسەری گاڵتەجاڕی ئازەربایجانی( جەلیل محەمەد قولی زادە)لە باکۆ ،بەتۆمەتی هێنانی دیوانەکانی نازم حیکمەت و نامەیەکی ئەوی ئاڕاستەی حزبی کۆمۆنیستی تورکیا، دەسگیرکرا.
بە لامەزەب وبێ ئایین تۆمەتبارکراوەو دەیان شکاتی لە دادگاکانی تورکیادا لێکراوە.. هەندێ پوڵدارو دەوڵەمەند خەلاتیان بە دۆلار بۆ ئەوکەسە تەرخان کردووە بیکوژێ.. چواردانە هەوڵی لەناوبردنی دراوەو دووا هەوڵ ئەوەبوو کە لەشاری (سیواس)دا درا.

نەسین دەڵێ: (یەکەم هەوڵی کوشتنم ئەوەبوو لەرێگەی گەڕانەوەم لە ئیستانبووڵەوە بۆ چاتاڵجا روویدا.زۆرم میزدەهات، لە (بیووك چەکمەچە) لە پاس دابەزیم و خۆم گەیاندە ژێر ستونێکی کارەبا میز بکەم. لەناکاو ئاگر لە تەلەکانەوە بەرزبۆوە، وامزانی کارەبا شۆرتی کرد.پاشان کەسانێك لێم نزیك کەوتنەوەو گوتیان : نەتزانی چی بوو؟ گوتم:نا ! گوتیان: کابرایەك تەقەی لێکردی!

هەوڵی دووەم لە چاتاڵجادا بوو، لەو عانەی لە باخچەی وەقفدا پیاسەم دەکرد، ئۆتۆمبیلێك بەخێرایی تێپەڕی و درامە بەرگوللە. ئەگەر شارەزا نەدەبووم و ئەوەی لە سەربازیدا فێریان ببووم بەکارم نەهێنابا، بێگومان دەیانکوشتم.. بەڵام یەکسەر خۆم دایە عاردو هیچم بەسەرنەهات.

هەوڵی سێهەمیش هەر لە چاتاڵجادا بوو. بۆ خواردنی ئێوارە بانگ کرابووم شەو درانگ منیان هێنایەوە وەقف. گوتم کاتەکەی ناوەختەو با کەس وەئاگا نەهێنم وبە ئاسپایی بخزمە نێو پێخەف. دەرگای دەرەوەی وەقفم کردەوەو کلیلم دەرهێنا دیقەتم دا دەرگای ژووری من لە ناوەوە گاڵەدراوە. بەرێوەبەری وەقفم وەئاگا هێناو زانیمان هێرش هێنەرەکان لە پەنجەرەوە چوونەتە ژوورەوەو دەرگایان داخستووە بۆئەوەی هەر لەنێو پێخەف بمخنکێنن، چونکە شریتی لە دەمبەستن بەکاردێ، لێیان جێ مابوو).

بەڵام هەوڵی(سیواس) شێوەیەکی سیاسیی بەخۆیەوە گرتبووکە لە ئەنجامی ئاگربەردانە ئەو هۆتێلەی وا دیدارەکەی لێ بوو بە مردنی سی و حەوت کەس لە بەشدارانی دیداری رۆشنبیری کۆتایی هات، لەم بارەیەوە عەزیز نەسین دەڵێ:

(کە ئاگرکوژێنەوەکان منیان لەنهۆمی سێیەمی هۆتێلەوە بینی، وایانزانی کۆمیسەری ئاکرگوژێنەوەم و لەنێو بڵێسەی ئاگردا ئابلۆقەدراوم.بەیەکتر دەڵێن با جەنابی کۆمیسەر رزگاربکەین.پەیژەیان بۆدرێژکردم. ئەگەر(لوتفی قەڵعەلی) نەبوایە لە نێو چڕە دووکەڵدا هیچم بۆنەدەکرا.ئەو منی لەپەنجەرەوە دەرهێناو خستمیە بان پەیژەو دابەزیم.هەر ئەوەندەو خەڵکەکە منیان ناسی!هاواریان کرد: هیزە ئەمە خۆیەتی نەجاتی مەدەن! ئەمە کۆمیسەر نیە شەیتانە بیکوژن! شارەوان ( ریشدارێك بوو) دەیقیژاندو خەڵکەکەی هاندەدا. پاشان ئاسنێکی لە دەست یەکێك وەرگرت و وەرگەڕایە لێدانم و لە بەرزایی چەند میترێکەوە وەعاردی کەوتم و بێهوش بووم. کە وەئاگاهاتمەوەو خۆم لە نێو ئۆتۆمبیل و لە نێوان دوو پۆلیسدا دۆزیەوە . یەکەمیان مستی دەخێواندمێ، هی دووەم دەستی دەگرت و نەیدەهێشت دارکاریم بکا. هی سێهەم( پێموایە لوتفی بوو) چاکێتەکەی کردە سەرین و لەژێر سەری دانام.

باشە عەزیز نەسین چی کردبوو وا هەزاران کەس لەخەڵکی سیواس بڕژێنە سەر شەقام و هاوار بکەن: (سیواس دەبێتە گۆڕستانی عەزیز نەسین؟)
وەڵام دەداتەوەو دەڵێ:
(لەو دیدارەدا قسەیەکی ئەوتۆم نەکردبوو ببێتە مایەی تووڕەبوونی کەس. بە پێچەوانەوە لە وتارەکەمدا پەسنی(پیر سوڵتان عەبداڵ)م کردبوو .گەلێ سەفەری سیواسم کردووەو لەسەر ئەوشارە خۆم حیساو دەکەم چونکە لەئەسڵدا (شەبین قەرە حەسار)یم کە سەر بەسیواسە. من بە بانگهێشتەی دەوڵەتەوە چوومە ئەوێ و والیش بەشداری دیدارە رۆشنبیرییەکەی دەکردو بەتەلەفۆن قسەم دەگەڵ (ئینۆنۆ)ی جێگری سەرەك وەزیراندا کردو چەند هاوکارێکیش هەر بەتەلەفۆن وەزیری ناوخۆیان لە هەراوهۆریای نێوشار ئاگادارکردەوە، بەڵام بەداخەوە کە لەبەرچاوی دەوڵەت سی و حەوت کەسی بێ تاوان لە چرقەی ئاگردا سووتان، بێ ئەوەی دەوڵەت فزە بکا.
ئەم رووداوە دووای دەرچوونی ئەو فەتوایە بوو کە تەهران بەتۆمەتی بڵاوکردنەوەی زنجیرەیەك لە وەرگێڕدراوی کتێبی(ئایاتی شەیتانی)ی سەلمان روشدی ، خوێنی عەزیز نەسینی پێ حەڵاڵ کردبوو. ئەوکات حزبی(رفاه)ی ئیسلامی لەهەڵبژاردنی شارەوانیدا چەند پۆستێکی وەدەست هێنابوو، لەوانەیش شارەوانیی سیواس.
تۆمەتی سەر بەچەپی خرایە پاڵ.. بە لایەنگری بەرەی سۆشیالیزم لەقەڵەم دراو بە سیخوڕی یەکێتیی سۆڤیەت زیندانی کراو دوورخرایەوە..بالیۆزخانەی دەوڵەتی ئینگلتڕاو میسرو ئێران لەدادگای تورکیادا شکاتیان لێ کردو شەش مانگی رەبەق لە زیندانیان پەست، چونکە لەسەر هەڵس و کەوتی ئەلیزابیسی کچی قرالیچە بەریتانیاو خوشکی فاروقی مەلیکی میسرو وژنی شای ئێرانی ئەوکات نووسیبوو.. هەر ئەوە دەڵێ:
(سلێمان دەمیرێل- دووای مستەفا کەمال ئەتاتورك- گەورەترین سیاسەتمەدارو رەوانبێژو خاوەن بەلاغەتێکی لە بن نەهاتووە بەسەعات دەئاخێوێ و قسە دەکا ، بێ ئەوەی مرۆ هیچی لێ تێ بگا..باس لەمەسەلەی کوردی تورکیا دەکا بەڵام هیچ وادەی چارەسەرکردنی نادا. ئەو هێمای سیاسەتی دیماگۆگیی تورکە).
محەمەد نوسرەت عەزیز (کەئەمە ناوی راستەقینەیەتی) لە ساڵی ١٩١٥دا لە دوورگەی- هەیبەلی-ی سەر بە ئیستانبوڵ لە خێزانێکی نیمچە هەژار لەدایك بووە( باوکی شێخی خاوەن تەریقەت بوو)بەمنداڵی لەبەرخوێندنی ئایینی داندراوە (فەقێ)،پاشان لە قوتابخانەی(داری

شەفەقە)دا کە تایبەت بە منداڵی هەتیوو کوڕە مسکێن و هەژار بوو، نێونووس کراوەولە پۆلی سێی سەرەتاییدا وەرگیراوە[٦]. ساڵی ١٩٣٥ ئامادەیی تەواوکردووەو چوّتە کۆلیژی سەربازی بۆتە ئەفسەری ئەندازیارو ساڵی١٩٤٤ لە سپا ئیستیعفای کردووەو لە رۆژنامەی (قەرەگۆز) و گۆڤاری (یەدی گون) ی (سیدات سیماوی) یەوە داخیلی جیهانی رۆژنامەنووسین بووە. کە حزبی گەلی کۆماری ساڵی ١٩٤٥ هاتووتە حوکم ، گۆڤار ڕاگیراوەو عەزیز نەسین بێ کار ماوتەوە.پاشان بەیەکەوە ساڵی ١٩٤٦دەگەڵ (سەباحەددین عەلی)[٧] گۆڤاری(مارکۆ پاشا)یان دەرکردووە کە ژمارەی تیراژی خۆی لە ٦٠-٧٠ هەزار دانە داوەو خوێنەر بە زەوقەوە گۆڤاریان دەکڕی و ئەودەست و ئەم دەستی دەکرد. دووای داخستنی گۆڤار، بە نێوی دیکەیان دەرهێناوە (مەعلووم پاشا، مەرحووم پاشا،بیزیم پاشا، حوڕ مارکۆ پاشا، عەلی پاشا،عەلی بابا)و لەنێوان ساڵانی ١٩٤٤-١٩٦٢ لە زۆربەی گۆڤار و رۆژنامەکانی تورکیادا بەرهەمی بڵاوکردووتەوە بە تایبەتی(قەرە گۆز،ئاق بابا،دوڵمش، ئەقشام..)و ساڵی ١٩٦٢ گۆڤاری (زبوك)ی گاڵتەجاڕی دەرهێناوەو وەکو زۆربەی هەری زۆری ئەدیبانەوە بە شیعر دەستی پێ کردووەو سێ دانە دیوانی هەن یەکەمیان (لەکۆتاییەوە بۆ سەرەتا)یە:

(هەوەڵ شیعرم دەنووسی بەڵام تێیدا سەرکەوتوو نەبووم: کە لە سپادا بووم بە نێوی (وەدیعە نەسین)ـەوە شیعرم بڵاو دەکردەوە، تەنانەت(عومەر بەدرەددین و رەمزی ئۆغوز ئاریك) هەڵسەنگاندنێکی باشیان لەسەر شیعرەکانی وەدیعە لە گۆڤاری (گەل) کە لە ئەنقەرەدا دەریان دەهێنا، بڵاوکردەوەو پەسنیان کردبوو.پاشان بۆم دەرکەوت بەکەڵکی شاعیری نایەم بەتایبەتی دووای چاوپێکەوتنم بە نازم حیکمەت، کە لە نەخۆشخانەی (جەڕڕاح پاشا)دا چارەسەر دەکرا.. ئەو کاتە گۆڤارێکی ئەدەبیاتم دەردەهێناوهەڵبەستم بڵاو دەکردنەوە بەڵام نەك بە نێوی خۆم. نازم حیکمەت پرسیاری لێکردم: ئەم شیعرانە هی تۆن؟ گوتم : بەڵێ . گوتی: تۆ چیرۆکی خنجیلانەو رێکوپێك دەنووسی، شیعر مەنووسە. بێگومان درانگ هەستم کرد کە لاسایی نازم حیکمەتم دەکردەوەو قەتاو قەت لاسایی ناگاتە ئاستی ئەسڵ).

عەزیز نەسین رۆڵێکی گرنگی لە سەندیکای نووسەرانی تورك دا گێڕاوەو لە زۆربەی هەڵبژاردنەکاندا دەنگی هێناوە بەتایبەتی دووای ساڵی ١٩٧٦ کە بە سەرۆکی سەندیکا هەڵبژێردراوەو ١٦ ساڵ سەرۆکی ئەوسەندیکایە بووە.بەر لەم تاریخە سەندیکا کە لە ساڵی ١٩٧٠دا دامەزرا دانی بە ئەدیبایەتی عەزیز نەسین نەدەهێناو وەکو سیاسەتمەدارێکی دەڕوانی کە چیرۆکی گاڵتەجاڕی بۆ وەدیهێنانی ئامانجی سیاسی خۆیەوە دەنووسێ و رەخنە لەدەوڵەت

دەگرێ و دژی ئیمپریالیزم خەبات دەکا.
گەلێ خەلاتی نێو دەولەتی وەدست هێناوەو بایەخی بە رێکخستنی رۆشنبیری دەداو پێی وابوو هێزێکی کاریگەرە دژی رژێمی سەرکوتکەر کە رێگەی داهێنان دەگرێ و نایەلێ گەشە بسێنێ. تەنانەت کە لەدەرەوەی رێکخستنیشدا بوو نێوانی دەگەلْ دۆست و هاوکارەکانیدا خۆش بوو. ئەندامێکی چالاکی یانەی دانەرو پەخشێنەران بوو کە بەکورتکراوەی(پەن) ناسراوە تا ئەو کاتەی یانە بە فەرمانی سپا داخراوە.لەم بارەیەوە دەلێ:
(رێکخستن- هەر رێکخستنێك بێ- دووئەرکی سەرەکییان هەیە، یەکەمیان مرۆ لە گۆشەگیری رزگاردەکا، دووەمیان پالەپەستۆی دیموکراتی پتر دەکا.ئەگەر رێکخستن بۆ خەلکی هاکەزایی پێویست بێ، ئەوە بۆ رۆشنبیران دەبێ بەزۆرەملێ بێ).
درێژە بە قسەکەی دەداو دەلێ:
(لە ولاتە پێشکەوتووەکاندا رۆشنبیری بی رێکخستن نادۆزیتەوە.بەلام لێرەدا-تورکیا-دەولەت خەلکی بێ رێکخستنی دەوێ..بۆ ؟ چونکە خەلکانێکی بێ رێکخستن لێخورینیان ئاسانە. سەد کەسی رێکنەخراو تەنیا سەد دانە کەسن، بەلام سەد کەسی رێکخراو هێزیکن گالتەی پێناکرێ. بۆیە کە دەولەت ناتوانێ رێگەی رێکخستن بگرێ، هەولی پەیداکردنی رێکخستنی لاواز دەدا، وەك ئەوەی دەگەلْ سەندیکای نووسەران کرا)[٨].
بۆدابینکردنی نانی رۆژانەی، ناچاربووە هانا بەرێتە بەرگەلیٚ پیشە.چونکە ناوەناوە بێ ئیشوکار دەبوو بەتایبەتی دووای دەرچوونیەوە لە زیندان. ئەوکاتە گۆڤارو رۆژنامەکان لە ترسی رژێم ناچار دەبوون وەدەری نێن و بەرهەمەکانی بلاونەکەنەوە:
(کە گۆڤارو رۆژنامە شتیان بۆم بلاونەدەکردەوە،خۆم گۆڤارو رۆژنامەم دەرهێناوە.کەچاپخانەکان نەوێراون شتم بۆ چاپ بکەن بەدەست روونووسم کردوون و فرۆشتوومن . کە بەرێوەبەرایەتی گرتووخانە قەلەم و کاغەزیان لێ قەدەغە کردووم( بە پێچەوانەی یاساکان) بەرهەمی خۆم بە نهێنی گەیاندە دەرەوەی زیندان).
وێنەگری فۆتۆگرافی و نووسەری سیناریۆ رۆژنامە فرۆشی گەرۆکی کردووە، ئەنجا نووسەرێکی لێهاتووی کە بە پەنجە ئیشارەتی بۆ بکەن و بۆ کۆنگرە ئەدەبییەکان بانگ بکرێ و سالی ١٩٩٢کۆلیژی هونەرە بالاکانی زانکۆی دارمشتادی ئەلمانی پێشنیاری بەخشینی بروانامەی دکتۆرای (فەخری)لە فەلسەفەی بۆ بکاو، پاشان لێی پەشیمان بێتەوە[٩].. لە داوێکەوە بۆ داوێکی دیکە، زمانی بەد بە خراوە باسی بکەن ..کەچی ئەم هەموو هەولانە کۆلیان پێ نەداوو

بڕوایان لەق نەکرد، بڕوا بە دژایەتی زوڵم و پرد دروستکردن لە نێوان قەوم و ڕەگەزو ئایینەکان و وتووێژ دەگەڵ راو بۆچوونی جیاواز.

بۆیەك ساتیش چیە لەکار نەوەستاوە.. دەیگوت:(ئەوانەی وەکو من پیشەیان نووسینە نابێ بوەستن). یوسف زیا ئۆرتاج دەڵێ: (عەزیز نەسین لە سەعاتی دیوار دەکا . وەستان نازانێ).

بەشان و بازوو ڕێگەی خۆی کردووتەوە ، بە خەباتی سەخت و گاڵتەجاڕی ورەی بەرزەوە وەك (میهری بەللی)ی نووسەری ناسراو دەڵێ:(کەسایەتی نەسین لەوە بەدەردەکەوێ کە لە سەختترین هەڵوێستی ژیانیدا توانیویەتی خەڵکی بەپێکەنین بینێ،بۆیە هەقە بەتێکۆشەری دەم بەخەندە ناوببردرێ).

دەیزانی کەلەپووری سوڵتانە عوسمانیەکان تا ئێستایش وەسەر کۆمەڵەوە زاڵن، دەیگوت : لێرەدا مرۆڤ نرخی نیە ! کەداوای هۆیەکەی دەکەی؟ دەڵێ:

(گوناهی کەلەپوورە.. بەتایبەتی ئەوەی لە سوڵتان محەمەد فاتیحەوە بەمیرات ماوەتەوە.کابرا ئاستێکی بەرزی رۆشنبیری بڕی بوو، گەلێ زیرەك بوو، چەند زمانیشی دەزانی و یەکەم حاکمە ڕێگە بدا (بۆرترێت)بکێشرێ، لەکاتێکدا کە وێنەی مرۆڤ بە کوفر دادەندراو وێنە تەنیا نەخش و جوانکاری لاپەڕەکانی کتێب بوون بە گوڵ وگوڵزار..سەرەڕای ئەمەیش ئەو سوڵتانە چ بەیاخێکی بە مرۆڤ نەداوە.

فاتیح فەرمانی داوە نیگارسازی ئیتالی (بیللینی) بێتە کۆشکی ئەوو ژووری تایبەتی بۆتەرخان بکرێ ،(سینان)ی ئاندازیاری رەوانەی هەندەران کردووە لە شێوەکاریدا قاڵ بێتەوەو فێری هونەرەکە ببێ. رۆژێکیان فاتیح سەردانی (بیللینی) دەکا، دەبینێ وا وێنەی ئەوی وەبان ئەسپەوە کردوە لەکاتی پەلدانی سەری یەکێك لەدوژمنەکانی. دیقەتی وێنە دەداو بە بیللینی دەڵێ: کەللەسەر واناکەوێتە بان عارد. بیللینی دەڵێ : من وافێربووم.هەرئەوکاتە فاتیح لە نۆبەتدارێکی رادەخوڕی زەلامێکی بۆ بێنن و یەکسەر کەللەسەری بەشیر دەپەڕێنن و بە بیللینی دەڵێ : بزانە کەللەی سەری بنیادم وا دەکەوێتە سەر زەوی!

دووای ئەم ڕووداوە بیللینی کلۆڵ بە هێمنی تورکیا جێ دەهێڵێ و دەگەڕێتەوە ئیتالیا.

سوڵتان محەمەد فاتیح بۆ تەختی سەڵتەنەت برای خۆی کوشتووە! ئەوەندەی نەمابوو ئێمەیش شتێکی وامان بەسەربێ.

پاش کودەتای ئەیلولی‌ساڵی١٩٥٥ لەگرتووخانەیان پەستاین. ژمارەمان لە نێوان٦٠-٧٠ نووسەر دەبوو. رۆژێکیان (والا نوورەددین-ئەوبوو خێزانی بوو؟ وەبیرم نەماوە)سەردانی ئێمەی

کردو به برادەرێکی گوتبوو کە لە سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراوەوە بیستوویەتی کە سپا لە سێدارەمان دەدا. کە هەواڵمان بیست ئەو ڕۆژە تائێوارە پێکەنین بەری نەداین و هەواڵمان بە گاڵتەو جەفەنگ زانی.بەڵام دووای حەوت ساڵان چاوم بە عەقیدێك کەوت کە ئەوکاتە ئەندامی دادگای سپا بوو، گەلێ ڕووداوی دڵتەزێنی ئەوکاتی بۆ گێڕامەوە وەك زیندە بەچاڵکردنی بێ دادگاو جۆرەها ئەشکەنجە دژی گرتووەکان. گوتی: ئەمرمان لە فەرماندەی ئیستانبووڵەوە - نوورەددین ئەقنوز پاشا- بۆ هات کە حوکمی لەسێدارەدانتان بدەین و لە گۆڕەپانی(ئەمین ئینۆنۆ)دا جێ بەجێ بکرێ. نەسین دەڵێ: نازانم هۆی چبوو ئەو حوکمە جێ بەجێ نەکرا ،بەڵام ئەو هەواڵەی کاتی خۆی - والا - بیستبووی ڕاست بوو[١٠].
ساڵی ١٩٧٠ عەزیز نەسین لە ناوچەی(چاتاڵجا ÇATALCA) پارچە عاردێکی کڕی و دەستی کردە دامەزرندنی وەقف و ساڵی١٩٧٤ نزیکەی بیست و پێنج هەتیوی بێ دایك و باوکی وەرگرت و لەوکاتەوە خۆیشی هەر لەو دەزگایەدا دەژی و بۆ ئەوەی لەنزیکەوە ئاگای لە باری گوزەران وپەروەردەی ئەو منداڵانە بێ، ژوورێکی بۆ نووسین و خەوتنی خۆی تەرخان کردووە،. بۆ نموونە ساڵی١٩٩٣ کۆی منداڵانی نێو وەقف ٢١ کوڕو ١٥کچ بوون گەوەرەکەیان تەمەنی بیست و دووساڵ و بچوکەکەیان نۆ ساڵ بوو،هەموویان خەریکی خوێندن بوون لە سەرەتایی و ناوەندی و کۆلیژو تا ئەو کاتە ٦٠ کەسیان بڕوانامەیان وەدەست هێنابوو.
وەقفی نەسین لەپارەی قازانجی نووسینەکانی عەزیز نەسینەوە (چ وەرگێڕان بێ و چ ئەو ڕۆمان و چیرۆکانەی دەکرێنە فیلم)مەسرف دەکرێ. توانیویەتی ئۆتۆمبیلێکی بۆ هاتوچوی منداڵان بکڕێ و پارچە زەوی یەکی دیکەیش لە ناوچەیەکی دیکەی دەوروبەری ئیستانبووڵدا زامن بکاو بینای ئێستاکەیش سێ نهۆمەو هۆڵی سەعی کردن و چێشتخانەو ژووری نووستنی تێدایەو حاڵی حازر دکتۆر عەلی نەسینی کوڕی وەقف بەڕێوە دەبا.
دەربارەی ئامانجەکانی ئەو دەزگا خێرخوازەوە، عەزیز نەسین دەڵێ:
(بەندە لە کتێبی-ترسان لە ترس-دا باسی ئامانجەکانی وەقفم کردووە، بەڵام ئایا هیچمان بەهیچ کردووە؟ نەخێر، چونکە لەلایەك پارەمان کەمەو لە لایەکی دیکەوە زۆر زەحمەتە خەڵکی وا پەیدا بکەین ئەو ئامانجانەمان بۆ بهێنێتە دی.
لێرەدا چمان مەبەستە؟ گەرەکمانە منداڵ پەروەردە بکەین. تاکە ئامانجمان ئەوە نیە منداڵ بڕوانامەی فێرگەی تەکنیکی یا پیشەسازی وەدەست بێنێ و ئیشوکار پەیدا بکا.ئەمە خۆی لەخۆیەوە گرنگە بەڵام دەمانەوێ هەندێ خەڵك پەروەردە بکەین کە وڵات پێویستی پێیانە.

چونکه ژمارەی کەسانی وا لە تورکیادا ئەمڕۆ زۆر کەمن.من لافی ئەوە لێنادەم کـە گـەرەکمان تورکیا رزگار بکەین، بیرۆکەی وامان نیەو شتی وا ئەسڵەن نابێ .ئێرە وەقفێکی ئەوتۆنیە کاری وا گەورەی پێ بکرێ. دەمانەوێ شتی دیکـە بکـەین.. سیاسـەتی پـەروەدو رۆشـنبیری تـورك سیاسەتێکی وابەستەی رژێمە و خەڵکی نانخۆر پەیدا دەکا. ئێمە شـتێکی بـە پێچـەوانەی ئـەم سیاسەتەمان دەوێ.

ناشمەوێ منداڵانی ئێرە ببنـە بەرهەمهێنـەری ماکینـەیی، چـونکە خـەڵکی دەرەوەی ئێمـە وا بیرناکەنەوە. قوتابخانەو بازاڕیش وانیە.

پێویستە سیاسەتی تورکیـا لەسـەر بناغـەی پـەروەردەکردنی مـرۆی بەرهەمهێنـەر بێ.بـێ ئـەم سیاسەتە لە بواری پیشەسازی و کشتوکاڵیدا تورکیا لەو قەیرانەی تێی کەوتووە ، رزگاری نابێ.

دووەم، گەرەکمان خـەڵکی وا پـەروەردە بکـەین بـە ئـازادی بـیر بکەنەوە.ئێمـە تـا ئێسـتا فێرنەبووین بە ئازادی بیربکەینەوە، چونکە ئەوانەی داخـوازی شـتی وا دەکـەن خـودی خۆیـان نایەنەوێ. داوی مافی ئافرەت دەکەن کەچی ئـەم مافـە بـەکار نـاهێنن. هەنـدێ تـابلۆ وەسـەر دەرگای ماڵاندا هەن ، ژنە نێوی مێردی دەنووسێ ونێوی خۆی وەلاوە دەنێ!

سێهەم، کە زۆر گرنگە، دەمانەوێ خەڵکانێك پەروەردە بکەین کە بە چـاوی رەخنـەوە دیقـەتی دنیا بدەن و سەر لە نوێ راستی بدۆزنەوە)

لە وەڵامی پرسیارێکدا کە ئایا وەقف لەلایان دەوڵەتەوە کۆمەك دکرێ؟ عەزیز نەسین دەڵێ:

(حەشتەبامان نادەنێ.. بەپێچەوانەوە ئێمە پارە دەدەینە دەوڵەت! کـە وەقفمـان دانـا دەوڵـەت ساڵانە یەك ملیۆن لیرە باجی خستینە سەر.ئێستا ملیۆنیك لێـرە هـیچ نیـە بـەڵام ئـەو کـات مەبلەغێك بوو گاڵتەی پێ نەدەکرا.هەوڵمداوە لە کاتو ساتی خۆیدا پارەکە نەدەم . زۆر جار بـە شکات و شکاتکاری ودادگا ئەنجا پارەمـان داوە، بـۆ ؟ چـونکە لـیرەی تـورکی رۆژ لـە دووای رۆژەوە بێ نرخ دەبێ و با سوود لەو بڕە پارەیەی ئێمە وەرنەگرن.

ئەم راستیەم بە پشکێنەرەکانی داراییش گوتووە.. گوتوومە ئەو(خـەراج )ـــەی لـە ئێمـەی دەسێنن حەرامە.

لە دەورانی (کەنعان ئێڤرەن)دا هەوڵیاندا تووشی گێچەڵمان بکەن و بە تۆمەت و بەهانە وەقـف داخەن. پشکێنەریان رەوانەی ئێرەکرد، لەحیسابمان وردبوونەوە، بەڵام چونکە هیچ سەرپێچـییان نەدۆزیەوە، زەفەریان پێ نەبردین.

بەڵی یارمەتیمان بۆ دێ، بەڵام زۆرکەم .خوێنەرانی بەرهەمی من خەڵکی رەشوڕووت وهەژارن.

دەشتوانم کۆمەگ و یارمەتی کۆبکەمەوە، بەلاّم لەو ترسەی نەبادا دۆستێك لەیەکێ لە چێشتخانەکاندا دەعوەتی نانی نیوەڕۆ بکەم ، یەکێك ببینێ و بلّێ: فەرموو ئێمە کۆمەکی وەقف دەکەین، کەچی عەزیز نەسین پارەی ئێمە دەداتە دەعوت ودەعوەتکاری!بۆیە داوای یارمەتی لە کەس ناکەم(١١).

## عەزیز نەسین و مەسەلەی کورد

لە بارودۆخێکی تەماوی وسەرپۆشکردندا سەبارەت بە زەوتکردنی مافی نەتەوەیی ڕەوای گەلی کورد لە تورکیادا، نووسەری پێشکەوتنخوازی تورك لەتەك چەند رۆشنبیرێکی دیکە ، لەریزی پێشەوەی بەرگری کردن لەو مافانە وەستاوە.

زەوتکردنی مافی گەلی کورد لە ڕادەبەدەرە.تەنانەت مێژوویان شێواندووەو کتێبیان داناوە هەر بۆ ئەوەی بسەلّمێنن کە خەلّکانێك لە تورکیادا نین بە نێوی کوردو ئەوانەی واخۆیان بەکورد لەقەلّەم دەدەن تورکی شاخن! هەموو ئەو راپەڕین و شۆڕشانەی دژی زولّم ستەمی فەرمانڕواکانی ئەوێ پەرپابوونە، بە یاخی بوونی عەشایەری لەقەلّەم دەدەن ودژ بە شارستانیەت وپێشکەوتنی دەزانن .تەنانەت کەسانێکی رەگەز پەرست، کورد تاوانبار دەکەن بەوەی تورك کەرکووکیان لەدەست چووە، بەبێ گوێدانە هیچ راستییەکی مێژوویی!

رەنگە هەر ئەم بەرچاوتەنگییە بێ کە نەوەی تورکی پێ پەوردە دەکەن، وا ئەم ولاّتە گۆشەگیر بێ و هەر چی گۆڕانکارییە -لەرووی بیرەوە- ئەوان مانای نەزانن و هۆی سەرەکیی هەرەس هێنانی بێ لەوەی کەچەند ساڵە هەوڵی چوونە نێو خێزانی ئەورووپی دەدا. لەلایەك بەرژەوەندی خۆی لە نێو ئەو خێزانەدا دەبینێ و لەلایەکی دیکەیشەوە ئامادە نیە مەرجەکانی جێ بەجێ بکا، لەوانەیش داننان بە مافی کورد.

وەزع بگاتە ئەو ڕادەیەی پزیشکێکی تورك (کە سوێندی خواردبێ دلّسوزی پیشەکەی بێ ) چارەسەری نەخۆش نەکا چونکە تورکی نەزانیوەو بەکوردی باسی لەدەردی خۆی کردووە! لەگەلّ ئەمەشدا گروپی سیاسی وا هەن حەز لە چارەسەرکردنی کێشەی کورد بکەن، بەلاّم دەسەلاّتیان بەسەر سپادا ناشکێ و بەرگەی چاوسوورکردنەوەی گروپە رەگەز پەرستەکان ناگرن، بۆیە دەبینین هەنگاوەکانیان لەسەرخۆوکزەو زووزوویش ناچار دەبن لە هەلّویستیان پەشیمان ببنەوە(١٢).

نموونەیەکی رەگەزپەرستانەی هەندێ لایەنی سیاسی تورك بەروونی لە هەلّوێستێکی (حزبی بزووتنەوەی نەتەوەییMHP) دا دەردەکەوێ کە چۆن داخوازی پێشکەش بە دادگای

دەستور کرد و داوای کرد حوکمی لەسێدارەدان بگەڕێتەوە، دووای ئەوەی وەگ مەرجێکی یەکێتی ئەورپا لابردرا.بۆ؟ چونکە دەست بەجێ تورکیایان قەبووڵ نەکرد و مەسەلەیان بۆ کاتێکی دیکە!

ئەو هەولانەی دەوڵەتیش بۆ رازی کردنی کوردی دەدا،هەولی نەزۆك وبێ ئەنجامن،چونکە هەنگاوێکی ئەوتۆیان دەگەڵدا نیە ناوچەکانیان پێ ئاوەدان بکرێتەوەو بەرەو پێشیان ببا.رۆژنامەکانی تورك دەڵێن بەشی مرۆی کورد لە سەرمایەی پیشەسازی ١٠٪و بەشی لە سەرمایەی بازرگانی ٢٪ونەخۆشخانەو فێرگە تەنیا لە مەڵبەندی شارەکاندا هەن و ئاستی بێکاری ٢٠٪کە لە ناوەند بەرزترەو ئەوانەی زمانی تورکی بەڵەد نین ٨٠٪ی کورد پێك دێنن،سەرەڕای نەبوونی خزمەتگوزاری کارەباو ئاوو رێگەوبان[١٣]

حکوومەتی تورکیا لە رووی گەشەکردن بەدەوام جیاوازی لە نێوان ناوچەکاندا دەکا. ئەو راپۆرتەی ساڵی ١٩٩٧ (دەستەی نەخشەکێشانی دەوڵەتDPT) بڵاوی کردەوە بووە مایەی سەرسوڕمانی هەموو گروپە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی تورك .راپۆرت دەڵێ ئەو پارێزگایانەی لەهەموو روویەکەوە پێشکەوتوون،ئەوانەن وا دەکەونە بەشی رۆژئاوای وڵات کە تورکی لێ نیشتەجێن.ئەو بەشە هەموو دەزگاو دامەزراوە پیشەسازی و بازرگانی بەخۆیەوە دەگرێ و دڵی ئابووری تورکن و٨٠٪ئەو ئابوورییە سەرچاوەی بەرهەمەکەی ئەوێیە، بە نەوت و بەنزینەوە. کەچی پارێزگاکانی کوردی لێ نیشتەجێن لەدامێنی هەرە خوارووی لیستەکە دێن وئەوەی پێی بگوترێ پرۆژەی پیشەسازی یا بازرگانی نابیندرێن. دەسکەوتی ساڵانەی کەسێکی لە رۆژئاوای تورکیا دادەنیشێ مەبلەغی ٥٩٢٤ دۆلاری ئەمریکییە، کەچی دەسکەوتی ساڵانەی یەکێکی خەڵکی شاری ئاگری تەنیا ٥١٤ دۆلارە![١٤] چەند راستییەکی تاڵ دووای بوومەلەرزەی ساڵی ١٩٩٩ بەدەرکەوتن و بەڵگەی ئەو ستەمەن کە لە کوردی دەکەن. دەرکەوت کە بە هەزاران دامەزراوی پیشەسازی ئۆتۆمبیل و شووشەو هی تر دەکەونە ناوچەی دەریای مەرمەرە کە لە بوومەلەرزە زەرەرمەند بوو(ئیستانبووڵ، ئیزمیت، سەقاریا، بورسە، بۆلو، یەلەوا، ئەسکی شەهیر)و٢،٤٥٪ی تێکڕای دامەزراوی پیشەسازی تورك پێك دێنێ.سەرەڕای چەند کارخانەیەکی پیشەسازی سەر بە کۆمپانیا بیانییەکانی وەك(تۆیۆتاو هیۆنداى وجۆدییێرو مانسمان و لاڤارچ..) و بە پێی مەزەندە سەرەتاییەکانەوە زیانی بوومەلەرزەی لەو ناوچەیە کەوت نزیکەی ٤٠ ملیار دۆلاربوو.

تەنانەت کە ژووری بازرگانی تورك پێشنیازی گوازتنەوەی نزیکەی ٢٠٠ کارخانەی پیشەسازی

بۆ باشوور کرد، بەتایبەتی کارخانەی کاغەزو لاستیك و ئۆتۆمبیل و بۆیە، سەرەك کۆماری پێشوو-سلێمان دەمیرێل- قایل نەبوو بەبەهانەی ئەوەی: هیچ شوێنێکی تورکیا لە بوومەلەرزە سەلامەت نیەو ٩٨٪ی دەکەوێتە سەرهێلی لێکترازان..پاشان بوومەلەرزە سەد ساڵ جارێك لە تورکیا دەدا! گوتیشی : بۆیە ئەوکارخانانە لەم ناوچەیەن چونکە ئەم بەشەی ولات ڕێگەوبان وکۆگای هەن بەتایبەتی هێلی دەریا.

دووای ئەو ناوچەیە (لەرووی پێشکەوتنەوە) ناوچەی دەوروبەری (دەریای ئیجە ) دێ ئەنجا ئەنادۆڵی نێوەڕاست و دەوروبەری دەریای سپی، لەکاتێکدا کە تێکڕای ئەو ناوچانەی ڕۆژهەلاتی باشوور و ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ کە ٤٤ پارێزگا بەخۆیانەوە دەگرن لەئەسڵی٧٦ پارێزگا، دەکەونە ژێر هێلی پێشکەوتنەوە [١٥]..

لە ئەنجامی ئەو سیاسەتە ئابوورییەی بە بەرنامە دارێژراوی ئاستەنگ لەبەردەم پێشکەوتنی ناوچەی کوردستاندا،پارێزگاکانی باشوورو ڕۆژهەلات ١٠-٥٠٪ی خەڵکەکەی لەبەر نەداری وبێکاری و یاسا سەرکوتکەرەکانەوە کۆچ دەکەن.بۆ نموونە شاری( تۆنجەلی)چارەگی دانیشتووانی بەرەو شارە گەورەکان یا ناوچە بازرگانیەکان بە دووای تیکەی نان کۆچیان کردووە.

لەم نێوەدا کەڵە نووسەرێکی وەك عەزیز نەسین دژی ئەم مێشکە ژەنگاویانە بوەستێ،کارێکە گاڵتەی پێناکرێ و بەشێکە لە دڵسوزیی ئەو جوامێرە بۆ نەتەوەیەك کە سەدان ساڵە لەپاڵ گەلی ئەودا دەژی. ئەم هەڵۆێستە بوێرانەی نەسین نامۆ نیە، هەرئەوە ڕۆشنبیرانی تورك بە ترسنۆك لە قەڵەم دەدا کە چۆن ملکەچی رژێمن و کتێبێکی لەم بارەیەوە داناوەو نێوی ناوە (ئاخ لە ئێمەی ڕۆشنبیرانی ترسنۆك). لە وەلامی پرسیارێکدا دەڵێ:

(شەرم دەکەم خۆم بە یەکێك لەو ڕۆشنبیرانە بزانم..مەترسی هەرەگەورەیش لەوترسەی ڕۆشنبیران لەوەدایە کە دەسەلات بەو پێیە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکا کە ترسنۆکن.ئەگەر وانیە، دەیانتوانی عەدنان مەندەرێس لەسێدارە رزگار بکەن).

لە پێشەکی کتێبی (تورکی بولگارستان، کوردی تورکیا) ولەژێر ناونیشانی (کێشەی کورد[١٦](KÜRT SORUNU) نەسین دەڵێ:

(لە مانگی ئابی١٩٨٧بەتەلەفۆن لەگۆڤاری (E DOĞRU ٢٠٠٠)ـە وە پێوەندییان پێکردم و گوتیان دۆسیەی کێشەی کوردیان لەبەر دەست دایەو ڕای منیان لەم بارەیەوە ویست.وەلامم دانەوەو گوتم: لەسایەی ئەم یاسایانەی هەنوکە هەن باسکردنی ئەم مەسەلەیە بێ سوودە.یەکەم شتی پێویستە بکرێ ئەوەیە ئەم یاسایانە بگۆڕدرێن تا مرۆ بتوانێ بە سەربەستی لەم کێشەیە

بدوێ و وتووێژی لەبارەیەوە بکا.خەڵکانێك بە رۆژی رووناك تووشی ئازار دەبن و تورك کورد بکوژێ و کورد تورك بکوژێ و ئەوکارانەی سپا پێیهەڵدەستێ چارەسەری کێشە ناکەن . مانەوە لەنێو بازنەی ئەو شڕە یاسا کۆنانە کە تاریخ و کەلەپووری خەڵکانێك دسڕێتەوە، گەورەترین هەڵەیەو هەمان هەڵوێستە کە لە بولگارستاندا رووبەروومان بۆوەو گوتیان رەگەزی تورك لەم وولاتەدا نیە. ئێمە هەمان رۆڵە دووبارەی دەکەینەوە بەوەی کە رەگەز بۆ مرۆڤ دەستنیشان دەکەین ودەڵێین: تۆ لە فلانە رەگەزی!

من بە راشکاوی دەڵێم گەلێك هەیەو کوردی ناوەوخاوەن کەلەپوورێکی تایبەتەو دەگەڵ سەربەخۆیی سیاسیدا نیم.ئەم گفتم تەنیا لەبەرژوەندیی تورك نیە،بەڵکو لە بەرژەوەندیی کوردیشە چونکە بارودۆخی دامەزراندنی دەوڵەتێکی سەربەخۆ لە رۆژهەڵات لەبارنیە. ئەمەی ئەمڕۆ لەتورکیادا روودەدا هەر لە گەمەی (ئەتاری)دەکاو هێزی دەرەکی هەن ئامانجی سیاسییان هەیە ئەم گەمەیە بەڕێوە دەبەن،لە قەیرانی یونانستانەوەو کێشەی ئەرمەن و سەربەخۆیی کوردو کێشەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و قسەی نابەجێی هەندێ کەس بەوەی مافمان لە مووسڵ وکەرکووکدا هەیە..ئەمانە پلانی گەمەی ئەتارین و بەگوێرەی هەندێ مەرجی دیاریکراو بەڕێوە دەچێ.لەبەر ئەوە من دەگەڵ گۆڕینی یاساکانم کە دان بەمافی گەلی کورد دەنێن و باوەڕیشم بە هەندێ داوای کوردان نیە کەداوای سەربەخۆیی دەکەن.

چاوەڕواتی هیچ سوودێك لە تیرۆر ناکرێ و تیرۆر دژی تیرۆریش بێ سوودەو کێشەکە چارەسەرناکا. دەوڵەتی تورکیا مەبەستی نیە رێگەچارە بدۆزێتەوە چونکە یاسای هەڵە جێ بە جێ دەکا کە چەندان ساڵە دانراون و کێشەیان دروست کردووە.زەقترین هەڵە ئەمەیە بگوترێ:(کورد نین، تورکن)هیچ نیشتمانپەروەریی پێ ناگوترێ ئەوکەسەی نەتەوە لەسەر مرۆڤ فەرزدەکا،چونکە مرۆڤ ئازادە خۆی بەکامە نەتەوە بزانێ.

ئەگەر حکومەتی تورك لەرۆژهەڵاتدا بەئەرکی سەرشانی خۆی هەڵدەستا، خەڵکی ئەوێ هەستیان بە گیروگرفت نەدەکرد..ئەگەر ناوچەکەی لەرووی ئابووری یەوە گەشە پێدەداو مافی رۆشنبیری خەڵکەکەی دابین دەکرد، ئەوە هیچ رووی نەدەدا.

خاڵێکی گرنگی دیکەیش هەیە،ئەوەیە کە حکومەت چارەسەری کێشەی بۆ ناکرێ چونکە حکومەتێکی هوشیار نیەو کێشەکەیش کۆنە.من پێموایە هێزی دەرەکی دەستی تێوەردەدەن و بەرژەوەندی یان لەوەدایە کە تورکیا ببێتە دەوڵەتێکی ئیمپریالیزم و سپاکەی پیاوکوژو جەردە.بۆیە لەقازانجی کوردو تورکانە کە بە ئەقڵ بیربکەنەوە. خەباتی سەربەخۆیی لەوەدانیە

منداڵی نێو بێشکە بکوژرێ یا پیرەمێردێکی بەساڵاچوو.ئەم کارانە هەستی تورکان دەبزوێنێ و کورد دەخاتە نێو دووفاق.چارەسەر لە لێك تێگەیشتن و ژیان بەیەکەوەی نێو نیشتماندایە).
کە گۆڤاری(E DOĞRU٢٠٠٠) بە دۆسیەی کوردەوە کەوتە بازاڕ، وەزارەتی ناوخۆ بەپەلە نووسراوی بۆ وەزارەتی داد رەوانەکردو داوای وەرگرتنی پێویستی کرد.وەزارەتیش لە رۆژی ١٩٨٧/٨/١٩دا فەرمانی دایە دەستەی دادوەری گشتیی دادگای ئاسایشی دەوڵەت لە ئیستانبوولڵ شکات لە گۆڤار بکا.دەستە دانەیەکی گۆڤاری بۆ پرۆفیسۆر(کەیهان ئیچەڵ)ی مامۆستای وانەی سزا لە کۆلیژی یاسای زانکۆی ئیستانبوولڵ رەوانەکرد بۆ ئەوەی لایەنی یاسایی دۆسیەکە هەڵسەنگێنێ و راپۆرتێك لەم بارەیەوە پێشکەش بکا.ناوبراو راپۆرتی ئامادەکردو دەسنیشانی شوێنە گرنگەکانی قسەی نێو تەلەفۆنی عەزیزنسین ووتاری محەمەد عەلی ئاییاری کردو بەڵگەی یاسایی هێنایەوە کە تاوانبارن، یەکەمیان داوای گۆڕینی یاسا دەکاو دووەم پەسنی کوردە جیاخوازەکان دەکا کە لەپێناو کوردستانێکی سەربەخۆدا دەکۆشن، ئەمەیش بەپێچەوانەی یاساکانە.
لە رۆژی ٣٠حەزیرانی ١٩٨٨ عەزیز نەسین لەبەردەم دادگای ئاسایشی ئیستانبوولدا وەستا نەك تەنیا بۆ بەرگری لە خودی خۆی بەلکو بۆ بەرگری لە نەتەوەی کوردو ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لەو بەرگری یە:
(سەرۆکی دادگا
ئەندامانی بەڕێز
گۆڤاری İKİBİNE DOĞRU بە تەلەفۆن رای منیان لەبارەی مەسەلەی کوردەوە وەرگرت و لەژمارەی ٩-١٥ی١٩٨٧دا بلاوکرایەوە.لێرەدا بڕبڕەیەك لەپێشەکی دۆسیەکە دێنمەوە کە دەڵێ: گرنگترین کێشەیە رووبەرووی تورکیا دەبێتەوە..من دان بەوە دەنێم کە کێشەی کورد گرنگترین کێشەی تورکیایە،گرنگییەکەی لەوەدایە کە دادگایەکی پسپۆڕی وەکو دادگای ئاسایشی ئیستانبوولڵ بەدەستەی بەرزیەوە ئەمڕۆ دادگایی ئێمە دەکا.
(بالاترین و گرنگترین دەزگای هەر دەوڵەتێك سەرۆکایەتی ئەرکانی گشتییە، لەبەر ئەوە بە دەگمەن ئەندامانی ئەو دەستەیە وێنەیان لە رۆژنامەکاندا بلاودەکرێنەوە یا لە کەناڵەکانی تەلەفزیۆن دەبیندرێن. پێم باشە هەڵوێستێکی ئەو سەرۆکایەتیە تان بۆ بەیان بکەم.
لە ١٢ی ئەیلوولی ١٩٨٠و بەر لەم تاریخەیش سەرۆکایەتی ئەرکانی تورکیا بایەخی بە مەسەلەی کورد دەداو ئەفسەری ڕەوانەی گۆشەکانی ولات دەکرد لە بارەی ئەم مەسەلەیە بۆ

خەڵکەکە بدوێن و راستییان بۆ شی بکەنەوە. لەو ئەفسەرانەی ئەم کارانـەیان پـێ سـپێردرابوو (رائیدی روکن ئۆغوز) بوو.نـاوبراو لــە ئــەرزەرۆم و بەرامبــەر ١٢٠ هــەزار هــاولاتی لەپشــت میکرۆفـــۆن وەســـتاو دووکتـــێبی بەدەســـتەوە بـــوون یەکەمیان(مێـــژووی وارتـــۆ) و دووەمیان(تورکەکانی لەدەوربەری دەریاچەی وان و روباری فرات دا دەژین)کە بەهەزاران دانەیان لێ چاپکراوەو چەند جاریش چاپکراونەتەوە .لە مەســەلەیەکی گرنگــی وەك مەســەلەی کــورد، رائید روکن فەرمووی:

(گەلی برادەران..بەشێك لە تورکە هەژارو نەدارەکان لە شاخە بەفراویەکانـدا دەژیان.رۆژێکیــان ئافرەتێك لەبان تەختە سەهۆڵێکەوە دەرۆیشت کە لەناکاو سەهۆڵ لەژێر پێیەوە شکاو دەنگێکی وەك(کــارد-کــورد)ی گــوێ لێ بوو،ئیــدی لــەو رۆژەوە ئــەو مســکێنە تورکانــەی لــە ناوچــە شاخاوییەکاندا دەژین نێویان نرا کورد)!!.

(سەرۆك و ئەندامانی بەرێزی دادگا

من ئێستاکێ لەبەرامبەرتان وەستاوم بەتۆمەتی بەرگری کردن لــە کەلــەپووری هاونیشــتمانانی کوردو بەهۆی باوەڕ نەکردنی هەڵبستراوی ئەرکان کە تورکە هەژارەکانی شاخ پێیان بە ســەهۆڵ کەوت و دەنگی (کارد-کورد)یان گوێ لێ بووو نێویان نرا کورد.. زێــدەرۆیی نیــە ئەگــەر بێــژم نەك تەنیا منی نووسەری چیرۆکی گاڵتەجاڕی ، بگرە هەموو نووسەرەکانی جیهــانیش نــاتوانین چیرۆکێکی کۆمێدی وەك چیرۆکی رائید روکن ئۆغوزی نێردراوی ســەرۆکایەتی ئــەرکانی ســپای ترك رێك بخەین!)

(جەنابی سەرۆك و ئەندامانی بەڕێز

جارێکی دیکەیش دەڵێم ئەم شکاتەی لە ئێمە کراوە شکاتێکی سیاسی یەو لەوانەی کردوویانەو لە ئێوەیش مەعلوومە. من پێموایە هێزێکی دیکە وەزارەتی ناوخۆو وەزارەتــی دادی هانــداوە. لەسەردانێکمدا بۆ بەڕێزان دادوەرە گشتییەکان بە تایبەتی بەڕێز (یەشار گون ئایدن) تێگەیشتم کە دەستەی دادوەر بەر لەوەی فەرمانی وەزارەتیان بۆ بێ بە سێ رۆژ گۆڤاریان بینیبوو هیچــی وایان تێدا نەدیبوو کە پێویست بکا شکاتمان لێ بکەن. من ئــەم کــارەی ئێســتاکێ دژی ئێمــە دەکرێ بە ئاسایی نازانم، چونکە تورکیا لە (نەعامە) دەکا، سەری لەنێو لم و زیخ دەنێ و ئاگای لە دەوربەری نیە!هەموومان دەزانــین دەزگــای ســیخوڕیی (MİT) لــە دووای مەســەلەیەو لــە ئەزمونی خۆمەوە دەزانم ئەو ئەمری فەرمووە بدرێینە دادگا).

(بانقی کار تــەواوی دانیشــتنە نهێنییــەکانی ئەنجومــەنی نەماینــدەکانی- پەرلــەمان-لەچــاپ

داوەتەوە( چوار جلّدن و بۆجاری سێهەم لەچاپدراونەتەوە)هەرچی ئاخاوتنی ئەتاتۆرکە لەبارەی کوردەوە دەریهێناون.پاشان گۆڤارێکی دیکە ئاخاوتنەکانی بلاّوکردووتەوەو بە هەزاران خوێنەر چاویان پێی کەوتووە. نیسبەت بە ئێمەیش بە هەزاران خوێنەر گۆڤاریان بینیوە کەچی تازە بەتازە دادگایی دەکرێین، واتا دووای سالێك).

(جێگری دادوەری گشتی (بولبان ئاقباش)دلێ زمانی رەسمی تورکیا تورکی یەو فێربوونی هەرزمانێکی دیکە هەولّی شێواندنی وەزعی ولاّت و نائارامی یەتی.من حەز دەکەم جەنابی بفەرموێ خۆی کەی لە ولاّتێکی دوورەوە هاتووتە تورکیا؟ ئایا نازانێ چەندین زمانی بێگانەی وەك ئیتالی، ئینگلیزی، فەرەنسی، ئەلّمانی..لە ئامادەیی و کۆلیژ و ئامۆژگاکاندا دەخوێندرێن؟ نازانێ دەولّەمەندو پولّدارەکانی تورك منداڵەکانیان رەوانەی ئەو کۆلیژانە دەکەن کە وانەکانی تورکی نین؟

مژدەتان دەدەمێ کە نیازوایە کۆلیژێکی ئەلّمانی و یەکی عەرەبی و یەکی ئینگلیزی بکرێنەوە. ئایا بۆ دەبێ تەنیا زمانی کوردی هۆی ئاژاوە بێو مەترسی لەسەر سەربەخۆیی نیشتمان پەیدا بکاو قەدەغە بێ؟).

(جێگری دادوەری گشتی و مامۆستای وانەی سزا لە کۆلیژی یاسای زانکۆی ئیستانبوولّ دەلێن: زمانی رەسمی تورکیا تورکی یە؟ باشە کێ بە پێچەوانەی گوتووە؟ تێکرای ئەو رۆشنبیرە کوردانەی من دەیانناسم، چ لە ئاخاوتنیاندا و چ لە نووسینەکانیاندا، کە داوای فێربوون بە زمانی کوردی دەکەن شتی وایان نەگوتووە..ئەوان نالێن با زمانی رەسمی تورکی نەبێ.. ئەمە درۆیە).

(ئەوانەی لە رۆژهەلاّت و باشووری رۆژهەلاّتی ئەنادۆلّ ژیاون شایەتی دەدەن- رەنگە ئێوەیش- کە خەلّکانێکی زۆر بە تایبەتی دەستەی ژنان چونکە کوردن تورکی نازانن و کە ئیشیان بکەوێتە بنکەی جاندرمەو دادگاو دەزگاکانی دەولّەت وەرگێریان بۆ دێنن. لەم حالّەتەدا فایدەی چی بگوترێ :کورد لە تورکیادا نین؟)!!

لەم دوواییەدا دادوەری گشتیی دادگای ئاسایشی ئیستانبوولّ داوای ١٥ سالّ حوکمی بۆ عەزیز نەسین و محەمەد عەلی ئایبار[١٧] و فاتیمە یازیچی کردبوو،بەلاّم چونکە هیچیان لەسەر ئیسپات نەبوو حوکم نەدران.

لەژێر ناونیشانی( تاوانێکی رۆشنبیری لە باشووری رۆژهەلاّتی ئەنادۆلّدا) رۆژنامەنووس (یۆکسەل سەلەك) چاوپێکەوتنێکی دەگەلّ عەزیز نەسین کردو لە تشرینی یەکەمی ١٩٨٩دا

بلاَوی کردەوە، نەسین باس لە پرۆژەی باشووری ئەنادۆڵ دەکا کە بە GAP ناسراوەو رووبەرێکی یەکجار فراوانی عاردی کشتوکاڵی دەخاتە ژێر ئاوو چەندین گوندو شارۆچکە وون دەبن، لەوانە شارۆچکەی(حەسەن کەیف)کە چەندین ئاسەواری تاریخی لێیە وەك قەلاو منارەو گومبەزو ئەشکەوت . سڕینەوەی ئەم شوێنەوارانە بە تاوان دژی گەلی کورد دادەنێ و داوا دەکا(یۆنسکۆ) پارێزگاریی لەو شوێنەوارانە بکا.

بەرگری نەسین لە گەلی کورد تەنیا کوردی تورکیا ناگرێتەوە بەڵکو وەك نەتەوە بەرگرییان لێ دەکا. کاتێ کە نوێنەری رۆژنامەی(جیهانی کرێکار) داوای لێ دەکا هەڵوێستی حکومەتی تورك هەڵسەنگێنێ بەوەی ٧٠هەزار کوردی عیراقی قەبووڵ کرد داخیلی تورکیا بن، لە کاتێکدا کە هەر ئەو حکومەتە هێرشی دەبردە سەر گوندی ئەو کوردانە بە بەهانەی ئەوەی یاخی بووان داڵدە دەدەن..عەزیز نەسین دڵێ:

(نەخێر راست نیە بگوترێ حکومەت ئەوانەی لە خۆشیی خۆیەوە قەبووڵ کرد. حکومەت ناچاربوو قەبووڵیان بکا.ئەمە خاڵێکی گرنگە . هەڵەیەکی زەقە بڵێین حکومەت هەڵوێستی مرۆڤانەی نواندووە.کوردی عێراق کەوتبوونە نێوان دوو ئاگرەوە، تەقەیان لەدووا بوو ، ناچار سنووری تورکیایان بزاند.ئەگەر تورکیا سنووری داخستبا کارەساتێکی گەورە رووی دەدا. ئێستاکێ لە تەلەفزیۆنەوە گوێ بیستی قسەو قسەلۆکی سەیر دەبین،کەسانێك دەڵێن ئەمانە پێشمەرگەن نەدەبوو حکومەت بهێڵێ بێنە تورکیاو با وەدەریان نێ.باشە ئەوە پێشمەرگە بوون! ئەمانە کوردن، چۆن لە تورکیادا کورد هەن ،لەعێراقیش کورد هەن.

رۆژنیە بە سەدان درۆمان گوێ لێ نەبێ کە دەوڵەتی تورك وای بۆ کردوون و وا دەکا!!دەوڵەتی تورك هاونیشتمانیی خۆی پشتگوێ خستووە، چۆن باوەڕ بکەین یارمەتی ئەو پەناهەندانە دەدا؟ لەهەموویش ناخۆشتر تورکیا یارمەتیی دەرەوەیان لێ قەدەغە دەکا. وەکو بزانم شتومەکێکی یەجگار زۆریان لە ئەوروپا بۆ کۆکراوەتەو بە تایبەتی لە ئەڵمانیاو هۆڵەندا کەچی حکومەت ئاستەنگەو نایەڵێ بەدەستیان بگا(١٨)

ئەوەندە ماوە بڵێین عەزیز نەسینی کەڵە نووسەرو مرۆڤ بەو بەرهەمە زۆرانەو بەو هەڵوێستە جوامێرانەی پلەی سێهەم لە ئەنسکلۆپێدیای تورك پێك دەهێنێ(دووای ئەتاتورك و نازم حیکمەت)و بەقەد ئەوەی گاڵتەجاربوو، ئەوەندەیش دۆستی گەلی کوردبوو

لە رۆژی ٥ ی گەلاوێژی ساڵی ١٩٩٥داو دووای بە شداریکردن لە ئیمزاکردنی کتێب لە شاری (چەشمە) کۆچی دوایی کردو تا دنیا ماوە کورد مەردایەتی ئەو جوامێرە فەرامۆش ناکەن.

## سەرچاوە و پەراوێز:

(*) ئەم وتارەم بەزمانی عەرەبی لە ژمارە ١٣١ کانوونی یەکەمی ٢٠٠٣ی گۆڤاری (مـەتین ) دا کە لـە دهـۆك دەردەچـێ بەناونیشـانی(سـلطان السـخریة الترکـی نصـیر الشـعب الکـردی) بڵاوکردەوە..پاشان بەزمانی کوردی لە ژمارە ( ١٤) ی ساڵی ٢٠٠٣ی گۆڤـاری( بـاریش) کـە وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی

کوردستان دەری دەکا، بڵاوبۆوە.

(١) شاعیری مەزنی تورکیا لە ١٥ ی کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٠٢ لە شـاری (سـەلانیك)داو لەخێزانێکی ناودار لە دایك بووە. باوکی (حیکمەت نازم ) کوڕی شـاعیر( نـازم حیکمـەت )ی یەکەمەو ماوەیەك والی دەبێ. دایکی( جەلیلە خـانم) کچـی فەریـد ئـەنوەر پاشـای یـاوەری سوڵتان عەبدولحەمیدە. جەلیلە لەسەر دەستی (فاوستۆ زۆنارۆ)ی هونەرمەندی تایبەتیی سوڵتان فێرە شێوەکاری بووەو بە یەکەم شێوەکاری ئافرەت لە دەورانی سوڵتانەکاندا دادەنرێ.

نازم ئامادەیی دەریاوانی تەواو دەکاو لە سوپای حەمیدیـە دەبێتـە ئەفسـەر بـەڵام بـە هـۆی نەخۆشییەوە لە سپا دادەبڕێو یەکەم هەڵبەستی ئەو کاتە بڵاودەکاتـەوە. لـە قونـاغی جـەنگی رزگاریدا روو لە ئەنەدۆڵ دەکات و دەبێتە مامۆسـتا. پاشـان دەچـێتە مۆسـکوو لـە زانکـۆی کۆمونیستی رۆژهەڵات دا نێونووس دەکرێو وانەی سیاسەت و ئابووری دەخوێنێ.

ساڵی ١٩٢٤ دەگەڕێتەوە تورکیا لە رۆژنامەی(ئایـدینلیك) دا شـیعرو نووسـین بڵاودەکاتـەوەو لەسەر ئەو نووسینانەی دادوەری گشتی داوای پێنج ساڵ زیندانی بۆ دەکـاو جـارێکی دیکـەیش پەنا دەباتەوە بەر یەکێتیی سـۆڤیەت و سـاڵی ١٩٢٨ دەگەڕێتـەوە ووڵات و سـود لـە یاسـای لێبوردن وەردەگرێ و لە گۆڤاری فەرمی دەوڵەتدا (ئای) دەست بەکار دەبـێ. سـاڵی ١٩٣٢ بـە چوار ساڵ مەحکووم دەکرێ ونیوەی حوکمەکە لە گرتووخانەدا بەسەر دەباو نیوەی دیکەی بـەر لێبوردن دەکەوێ و لە بواری رۆژنامە گەری و سینەمادا کـار دەکا.سـاڵی ١٩٣٨ بـە تۆمـەتی هاندانی یاخیبوون بیست و هەشـت سـاڵ و چـوار مـانگ حـوکم دەدرێو لـە گرتووخانـەکانی (چانکیری )و(ئەسکۆدار) و ( بوورسا ) حوکم بەسەر دەبا. ساڵی ١٩٥٠ بەر لێبـوردن دەکـەوێ ودەچێتە رۆمانیا وپاشان مۆسکۆ.

ساڵی ١٩٥١ دەوڵەتی تورکیا رەگەزنامەی لێ دەسێنێتەوە.

پێنج ژنی هێناوه (نوزهەت، لینا، پێرایه ، مونەووەر، ڤێرا) کوڕێکی له مونەوەر هەیەو نێوی محەمەده ولەگەڵ دایکیدا له فەرەنسا دەژیا.دووا ژنیشی (ڤێرا)یەو لەرەگەزی رووسەو له سەرەتای سالآنی ۲۰۰۰ دا کۆچی کردووەو.
نازم له ۳ ی حەزیرانی سالّی ۱۹٦۳ دا و له ئەنجامی قەیرانی دڵ له مۆسکۆ کوچی دووایی دەکاو له گۆڕستانی(نۆڤۆده ڤیچیه) دا بەخاك دەسپێردرێ.
(۲) سالّی۱۹۲۳ له (عوسمانیه)ی سەربه ویلایەتی (ئەدەنا) له خێزانێکی کورد له دایك بووه. دایکی نێوی (نیگارخانم) وباوکی جوتیار بووه به نێوی (سادق)و له مزگەوتی گوندو لەبەر چاوی یەشاری کوڕیدا (ئەو کاتەی منداڵ دەبێ) دەکوژرێ.بەهۆی بینینی رووداوی کوشتنی باوکییەوه یەشار چاوێکی نیمچه کوێر دەبێ.
له تەمەنی حەڤده سالّیدا ودووای تەواوکردنی قوتابخانەی ناوەندی له سالّی ۱۹٤۰ دا شیعرەکانی له گۆڤاری (چیغ) دا بلآودەکاتەوه پاشان له هەر یەك له گۆڤارەکانی (ئولکه)، (میللەت) ،(کۆڤان )،( بێش پنار) دا **بلآودەکاتەوه هەر لەو کاتانەیشدا تێکەڵ** به دنیای سیاسەت دەبێ و سالّی ۱۹٥۰ به پێی ماددەی ۱٤۲زیندانی دەکرێ.
سالّی ۱۹٥۱ دەبێته پەیامنێری رۆژنامەی( جومهورییەت)و ریپۆرتاژ ئامادە دەکاو ناوه ناوەیش وتار دەنووسێو تا سالّی ۱۹٦۳ لەم کارەیدا بەردەوام دەبێ.
سالّی۱۹٦۲ پێوەندیی به پارتی کرێکارانی تورکیاوه **دەکا و دەبێته ئەندامی ئەو حزبه .**
**سالّی۱۹٦۷گۆڤاری( ئانت) دەردەکا و به هۆی وتارێکەوه ۱۸ مانگ حوکم دەدرێ بەلآم جێ به جێ ناکر ێ و به هۆی نووسینێکی دیکەوه له گۆڤاری (دێرشپیگل) ئەڵمانیدا بیست مانگ حوکم دەدرێ بەلآم ئەویش جێ به جێ ناکرێ.**
**سالّی ۱۹٥٥ رۆمانی (ئینجه مەمەت) ی خسته بازاڕەوەو بەیەکێ له هەره رۆمانه سەرکوتووەکانی ئەدەبیاتی تورکیا دادەنرێ و خەلآتی لەسەر وەردەگرێ .**
**بەرهەمەکانی وەرگێڕدراونەتەوه سەر زیاتر له سی زمانی زیندووی دنیاو گەلێ خەلآتی جۆراو جۆری پێ براوه لەوانه خەلآتی فەرەنسی لەمەڕ(باشترین رۆمانی بێگانه).**
**ژنی نێوێ(تێلدا) بوو که بەڕەگەز ئەسپانی بوو له دایکبووی سالّی۱۹۲۳ بوو چاکەکەیەکی زۆری له سەر یەشار کەماڵ هەیه بەوەی ۱۷ کتێبی ئەوی کردوونەته ئینگلیزی و هەر ئەویش وای کردووه بەرهەمەکانی بکرێنه ئیسپانی و فەرەنسی و له رۆژئاوادا شۆرەت پەیدا بکا. تێلدا له شوباتی سالّی ۲۰۰۱داو له تەمەنی ۷۸ سالّی له ئیستانبوولداأ کۆچی دوایی کردووه.**

یوشار بەرهەمێکی زۆرو زەوەندی لە بواری رۆمان و شانۆنامەو ریپۆرتاژو وتـارو رەخنــەدا هەیەو یەکێ بوو لە پالێوراوانی خەلاتی نۆبل و جێگایەکی دیارو تایبــەتیی لــە ئــەدەبیاتی تورکیادا هەیە .

مامۆستا عبدالله حسن زادە (ئینجـە مەمــەتی) یەشـار کـەمالی لـە فارسـییەوە بـە نێـوی (حەمەدۆك)ـەوە کردووتە کوردی و لە لایەن دەزگای رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی یەوە لە بەغدا چاپ کراوە.

(٣) دوو رۆمانی کراونەتە کوردی-گێلە پیاو-و- برایم زەبۆك-لەگـەلّ چـەند دانـە چـیرۆکێکی کورت کە لە دە کتێب تێپەڕ ناکەن.

(٤) نەسرت مەردان گێڕایــەوە وگـوتی :وەزارەتـی راگەیانـدنی عـیراق سـالّی١٩٧٥ عــەزیز نەسینی دەعوەت کردو سەردانی بەغداو کەربەلاو کەرکووکی کـرد. دیـارە لــەو سـەردانەیدا راستیی رژێمی عیراقی بۆ دەرکەوتووە،کە گەڕایــەوە زنجیرەیــەك وتـاری دژی رژێـم نووسـی. رۆژێکیان بالّیۆز بانگی کردم و ناڕەزایی حکومەتی لە وتارەکانی عەزیزنەسین دەربـڕی، بــەو پێیەی من دەستم بووە لەو دەعوەتە. کابرا ڕای وابوو یا بەبڕی پارە یا بـە گـەف و تۆقانــدن دەمکوتی بکەین.گوتم :عەزیز نەسین رەخنە لە حکومەتی خۆی دەگرێ و جنێـو بـە سـەرەك کۆمار دەداو باکی نیە، لە چاوسورکردنەوەی سەفارەتێکی بێگانە دەترسێ؟ (وتارەکـانی لـە توی کتێبێکدا کۆکردەوە نێوی نا

-Dünya Kazan Ben Kepçe-ئـ-عیراق و میسر).

(٥) نووسـەری راسـتڕەوی تـورك قادرجـان قـافلّی-جانـەوەری تـۆرۆس-پێشـەکی د. ابـراهیم داقوقلی- وەزارەتی راگەیاندن- کوێت ١٩٨٦.

(٦) نەسین دەلّێ بیرۆکەی دامەزرانی هەتیوگەم ئەو کاتە بۆهات کە لەو قوتابخانەیەدا دەخوێند.

(٧) شاعیروچیروك نووسێکی تورکی بلّیمەتـە . لـە ٢٥ی شـوباتی سـالّی ١٩٠٧ لـە گونـدی (ئەگریدەرە)ی سەربەقەزای( گوملجینە)ی سەر سنووری نیـوان تورکیـاو یونانسـتان لـە دایـك بووە.خوێندنی لە بالیکشەهیرو ئیستانبوولّدا تەواو کردووەو بۆتە ماموستای زمانی ئـەلّمانی. لەسەر حسێبی دەولّەت رەوانەی ئەلّمانیا کراوەو لەهــەردوو شـاری پۆتسـدام و بـەرلین دەرسـی مامۆستایی خوێندووەو گەڕاوەتەوە تورکیاو سەرەڕایپیشەی مامۆستایەتی، دەستی بە نووسـین کردووەو ودرامای بۆ شانۆ نوسیووە. سالّی ١٩٣١ بە تۆمەتی پرۆپاگەندە دژی دەولّەت ٣مانگ گـیراوە.دووای ماوەیـەکی کـورت دیسـان گـیراوەو حـوکم کـراوەو بەبۆنـەی یـادی دەسـالّەی

دامەزراندنی کۆمار بەر لێبوردن کەوتووە و ئازاد کراوە. تا ساڵی ١٩٤٥ بێ ئیشوکاربووەو لەو ساڵەدا بەیەکەوە لەگەڵ عەزیز نەسین گۆڤاری گاڵتەجاڕی (مارکۆ پاشا)یان دەرکردووە، کە تیراژی لە ٦٠-٧٠ هەزار دانە تیپەڕی دەکرد.
بەهۆی نووسینە ڕەخنەئامێزەکانی لە گۆڤاری بڵاودەکردنەوەو بە تۆمەتی
ناوزڕاندنی دەوڵەت جارێکی دیکەیش گیرا. پاش ئازادبوونی هەوڵ دەدا تورکیا جێ بهێڵێ و پەنا بباتە بەر ئەڵمانیاو لە ٢ی نیسانی ساڵی ١٩٤٨ دا لە نێودارستانەکانی سەر سنووری تورکیاو بولگارستاندا بە دەستی نەتەوەپرستێکی تورکی توندرۆ (علی ئەرتەکین) ناوێك کوژراو. دەڵێن ئەو علییە پیاوی دەزگای (میت)بووە و بە فیتی ئەو دەزگایە صباحەددینی گوشتووە.
گەلێ رۆمان و چیرۆك و شانۆنامەو وتاری ڕخنەیی بلاوکردوونەتەوەو بە دامەزرێنەری ئەدەبی نوێی تورکیا دەژمێردرێو ١٠ دانە بەرهەمی چاپکراوی هەیە. مامۆستا هەژار ئەوە کاتەی بۆ چارەسەری نەخۆشیی ساڵی ١٩٥٧دەچێتە لوبنان ، لە رۆژنامەیەکی ئەوێ چیرۆکێکی کورتی وەرگێڕدراوی سەر زمانی عەرەبی دەخوێنێتەوە و کاری تێدەکا ناوەرۆکی چیرۆك بە شیعر دادەڕێژێتەوەو نێوی دەنێ(بەیتی سەرە مەڕ) یا (کۆشکی بەللووری) کە بە شاکارێکی نەمر دەژمێردرێو لە دیوانی ( بۆ کوردستان) دا هەیە.
(٨) چاوپێکەوتنێکی رۆژنامەنووسیی رەخنەگری ناودار (دۆغان هیزلان) لە گۆڤاری(گۆستێری)دا بلاوکراوەتەوە. بڕوانە- خاکی نەفرەت لێکراو-کۆمەڵە چیرۆك-وەرگێڕانی سعید یحیی ١٩٩٨.
(٩) دووای روخانی دیواری بەرلین و یەکگرتنەوەی ئەڵمانیا ساڵی ١٩٩١ ویستیان (ئەریك هۆنیکەر)ی سەرۆکی ئەڵمانیای رۆژهەلات بە تۆمەتی پێشێلکردنی مافی مرۆڤەوە بدەنە دادگاو هیچ بالیوزخانەیەك قایل نەبوو دالدەی بدا. ئەوکاتە عەزیز نەسین نامەی بۆ سەرانی دنیا نووسی و داوای لێکردن هۆنیکەر بە پەناهەندە وەربگرن. بەمەیش نەوەستا داوای لە کاربەدەستانی تورکیا کرد رێگەی بدەن بێتە تورکیاو لە وەقفی نەسین دا بژێ. ئەم هەڵوێستەی بووە هۆی ئەوەی زانکۆی ئەڵمان پەشێمان ببێتەوەو دکتۆراکەی نەداتێ.
(10) Demirtaş Ceyhun– ASİLACAK ADAM AZİZ NESİN-AD Yayıncılık A-Ş Eylül 1994
(11) AZİZ NESİN –ONURSAL DUKTORA OLMAMANIN BÜYÜK ONURU-ADAM YAYINLARI 1993

(١٢) بوڵەنت ئەجەویتی سەرەك وەزیرانی پێشوو وادەی دا بەرنامەی كوردی لە كەناڵێكی دەوڵەتەوە TRT پەخش بكرێ كەچی ئـەو وادەیـە لـە حـوكمڕانی ئـەودا جـێ بەجێ نەكرا.

(١٣) مەسەلەی كورد لە راپۆرتی دەوڵەتە زلەكانەوە.ژمارە ٦٩ ی ١٩٩٧ی گۆڤاری مەتین.

(١٤) عەزیز نەسین باسی كارگەیەكی (هەتیو)ی پـێڵاو دەكـا لەسـەر رێگـەی (مـاردین ) دا بەرچاوی كەوتووە كە چۆن هێزەكانی ئاسایش دەستیان بەسەردا گرتـووەو كردوویانەتـە شـوێنی لێكۆڵینەوەو ئەشكەنجەدان.

(١٥) یوسف ئیبراهیم ئەلجەهمانی- بوومەلەرزەی توركیـا- دەزگـای چـاپەمەنیی حـۆران- سوریا-٢٠٠٠.

(16) BULGARİSTAN' DA TÜRKLER TÜRKİYE' DA KÜRTLER– ADAM YAYINLARI – Beşinci Basım 1989

(١٧) سیاسەتمدارو و نووسەرێكی چەپڕەوە كوڕی عەقیـد تەحسـینەو پـورزای نـازم حیكەتـەو بەتەمەن لەو بچووكترە . زنجیرەیەك رۆژنامەی سەربەخۆی بڵاوكردووتەوەو بەیەكەوە دەگەڵ نـازم گیراون . ساڵی ١٩٦٠ (حزبی كارگەرانی توركیا)ی بیر سۆشـیالیزمی دامەزرانـدووەو خۆیشـی سكرتێری بووە. دژی دەست تێوەردانی یەكێتیی سوڤیەت بووە لـە چیكۆسـلۆڤاكیادا. زۆربـەی ئەندامانی حزبەكەی سەر بە سەندیكای كرێكاران بوون. ساڵی ١٩٦٢ یەشـار كـەمال بـوو بـە ئەندامی ئەو حزبە.

(١٨) işçi Dünyasi تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٨٨.

# فيل حەمدی چۆن دەسگیرکرا؟

لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی ئیستانبوولەوە ئەم بروسکەیە بۆ تەواوی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی شارەکانی دیکە ڕەوانە کرا:

(تەمەن سی وپێنج ساڵ،باڵابەرز، دووسەد کیلۆ کێش، سێ دانە ددانی کەم،ددانێکی چەناگەی ژووری پڕکراوەتەوە،کاڕێژەی ژێری لای چەپ لە زێڕگیراوە، قاتێکی خەتخەتی قاوەیی دەبەر، قژی تا ئەندازەیەك رووتاوەتەوە،دەموچاو ئەبڵەق،چاو قاوەیی ڕەنگ،فیل حەمدی ناوە،خاوەن رابردووەکی پڕلە تاوان، سێ شەوو سێ ڕۆژ دوو پۆلیس بێ چاونوقاندن نۆبەتیان لێ گرتووە ،بەڵام خەویان لێ کەوتووەوئەویش فرسەتی هێناوەو ڕای کردووە.بەپێی لێکولینەوەمان فیل حەمدی خۆی گەیاندووتە یەکێ لە ویلایەتەکانی ئێوە. تکایە هەوڵ بدەن بەزووترین کات دەسگیری بکەن وزۆر بە وردی لە گرتووخانەدا چاودێری بکەن،یا پۆلیسی بەگەڵ بدەن و ڕەوانەی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی ئیستانبوولی بکەن. تکایە بەزووترین کات ئەم کارە بکەن. لەگەڵ بروسکەماندا وێنەیەکی فۆتۆگرافی فیل حەمدیتان بۆ ڕەوانە دەکەین)

* * * *

لەیەکێ لە ویلایەتەکانی دەرەوە، دوو پۆلیس لە وێزگەی شەمەندەفەردا وا دەئاخاوتن:

- ڕەمەزانی برام، ئەو کابرایەی وا سەلەپ(*) دەنۆشێ کتومت فیل حەمدی یە.

-هاااا..لەو دەچێ.. وێنەی دەربێنە با تەماشایەکی بکەین.

وێنەیەك دەردێنێ و نیشانی هاوڕێکەی دەدا.

-ڕەمەزان ئەمە خۆی نیە.ئەمە وێنەی خۆتە!

-هاااا..لەجەژن گرتوومە، چۆنە؟

- باشە، بەڵام پێکەنینەکەت زۆر ناحەزە! وێنەی فیل حەمدی بدۆزەوە.

ڕەمەزان لە گیرفانیەوە وێنەیەك دەردێنێ و دەڵێ:

ئەمە وێنەی کوڕمە، یادگاریی سەربازییە.. ئەرێ ئەمە کێیە مەحموود؟

-ئەمە؟ هینە..عەلی یە دووکەڵی قاچاغچی حەشیشـەیە.ئەمەیش مشـکی هـۆتێلان سـوبحی یە.. وێنەکان بە یەکترییەوە نووساون. وێنەی فیل حەمدی بدۆزەرەوە رەمەزان!

مەحموودو رەمەزان خەریکن وێنەکان جیا دەکەنەوەو بەدووای وێنەی فیل حەمدین.

-مەحموود زووکە، کابرا سالپی خواردەوەو رادەکا.

- تەماشا، چۆن ئاوڕ لەولاو لەم لا دەداتەوە؟

- دۆزیمەوە، ئەمە وێنە ، تەواو لەو دەچێ!

بەرەولای کابرا دەچن:

- کابرا بوەستە.

تەماشای کابراو دیقەتی وێنە دەدەن :

باش بوەستە بزانم.

- ئاخ !رەمەزان لەو ناچێ!

-مەحموود، با بیبەینە پۆلیسخانە، کۆمیسێریش بیبینێ.

-کابرا پیێشمان کەوە.

* * * *

لە ویلایەتیکی دیکەدا دوو پۆلیس لە بازاڕدا دەخولانەوە:

- کاکە شوکری، شوورەییە، لەبەیانیەوە تا ئێوارە خولاینەوە ،ئەم فیل حەمدیەمان دەسگیر نەکرد؟

-ئەم کابرایە خۆی نەبێ؟

- رەنگە هەوبێ، با پرسیاری لێ بکەین.

لە کابرا نزیك دەکەونوە:

- برا ،تۆ ناوت چیە؟

-موستەفا.

لەبناگوێی یەکتری:

-دەڵێ موستەفا..

-ئەی خۆ نالێ حەمدی؟ ناوی خۆی دگۆڕێ..

-بەهەموو ئەقڵی خۆی ئێمە هەڵدەخەڵەتێنێ!

- فەرموو پیێشمان کەوە..

* * * *

له ویلایەتێکی دیکەدا دوو پۆلیس لە چایخانەدا دانیشتوون و قسە دەکەن:
-دوێنێ بەندە سێ دانە فیل حەمدیم دەسگیرکردن، کۆمیسێر هیچ کامیانی بەگەن نەکرد.
- ئەم کۆمیسێرەی ئێمەش بەلایە ها..
-هششش! لەسەرخۆ، دەنگ هەڵمەبرە.. تەماشای چاوی ئەو کابرایە بکە وا چای دەنۆشێ ، هەر لەو دەچێ.
-بەڵام لەنووسراوەکەدا کابرا قەڵەوە.ئەمە لاوازە دەڵێی پەیکەرە ئێسقانە!
- لاوازبووە. بۆچی قاچاخچییەتی ئاسانە؟
- راستە.. بەڵام ئەمە رەشتاڵەیە.. فیل حەمدی گەنم ڕەنگە!
- ئەوەندەی بەشاخاندا هەڵگەڕی ڕەشبووە.
-راست دەکەی.. بەڵام ئەم کابرایە قژی رەشە، کەچی لە بروسکەکەدا نووسراوە فیل حەمدی تووکی بەسەرنەماوە!
-کاکە زۆر زەحمەت نیە، کابرا بارۆکەی لەسەرناوە تا نەیناسنەوە.
-چ دەڵێی ، بیگرین؟
لە کابرا نزیك دەکەونەوە:
- ناوت چیە؟
-حەمدی..
پۆلیس تەماشای یەکتر دەکەن و پێدەکەنن.
- پێشمان کەوە.
-بۆ؟ چ بووە؟
-زۆر پرسیارمەکە! لەپۆلیسخانەدا تێدەگەیەنین!

* * * *

لە ویلایەتێکی دیکەی دەرەوە، وەکو هەموو ویلایەتەکان دوو پۆلیس کابرایەك لەدەوروبەری شاردا دەسگیر دەکەن:
-دەمەت بکەرەوە!
- هیچم لەدەمدا نیە.
-کە هیچت لەدەمدا نیە ،بیکەرەوە.

کابرا دەمی دەکاتەوە.هەردوو پۆلیس تەماشای نێو دەمی کابرا دەکەن. یەکێکیان بە هەواڵەکەی دەڵێ:

- تەماشای نووسراوە بکە، بزانە چەند ددانی کەمن؟

پۆلیس نووسراو دەخوێنێتەوە:

-سێ دانە ددانی کەمن،ددانێکی چەناگەی ژووری پڕکراوەتەوە، کارێژەی ژێری لای چەپ لە زێڕگیراوە.

پۆلیس ددانەکانی کابرا دەژمێرێ:

-یەك،دوو،سێ..چوار..کورە مەبزووە سەرت.لێشێواندم .یەك،دوو،سێ،چوار

.پێنج..بیست و چوار..بیست و چوار ددانی هەیە.

-بیست و چوارە؟چەندی کەمن؟ کابرا تۆ چەند ددانت نەماون؟ نازانی؟

- هەشت..

- دەریهێناون. تا بەڵگە بەدەستەوە نەدات.

- ددانەکانی من دەسکردن، تاقمن. هیچ ددانم نەماون، تەنانەت چواردانەیان لە چەرز خواردن شکاون.

-نووسراو باسی ددانی تاقم دەکا؟

-نەخێر باس ناکات.لە بیریان چووە. کوڕە ئەمە خۆیەتی،ئەوە نیە کارێژەی ژێری لە زێڕ گیراوە؟ برا فەرموو بەگەڵمان کەوە.

-بۆکوێ؟

-پۆلیسخانە!

* * * *

بەسەدان بروسکە لە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی ویلایەتەکانی دەرەوە دەگەیشتنە بەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی ئیستانبوڵ

(نیشانە بە بروسکەی ژمارە ئەوندەی رۆژی ئەوەندە :لەسنووری ویلایەتەکەماندا بیست ودوو فیل حەمدیمان دەسگیرکردووە.چواردەیان جل و بەرگی قاوەیی خەتخەتیان دەبەرەو هەشتیشیان کارێژەیان لەزێڕ گیراوە .تکایە ئاگادارمان بفەرموون فیل حەمدی دیکە بگرین یا ئەوەندە بەسە؟)

* * * *

(ئەمە وەڵامی فلانە بروسکەتانە:
لە سنووری ویلایەتەکەماندا لـە نێـوان ١٨٠ کیلـۆو ٢٢٠ کیلـۆدا دوو دەرزەن فیـل حەمـدی دەسگیرکراون وهیچ شوێنێك کە گومانی لێ بکرێ نەماوە نەیپشکنین و بەم نزیکانە هـەموویان ڕەوانەی لاتان دەکەین. هەندیکیش رایانکردووە،بەڵام ئێمە زۆر بەدیقـەت چـاودێرییان دەکـەین وبەم زوانە ئەوانیش دەسگیر دەکرێن و ڕەوانەیان دەکەین، لەگەڵ ریزماندا)
لەبەڕێوەبەرایەتی ئاسایشی ئیستانبووڵەوە ئەم بروسکەیە ڕەوانەی تەواوی ویلایەتەکان کرا:
(لەبەر ئەوەی جێگە نەماوە، حاڵی حازر ئەو فیل حەمدییانەی گرتووتانە بەسن. تا فەرمانێکی دیکەتان بۆ دێ تکامان وایە کەس ڕەوانە مەکەن)

تێبینی: کاتیی ئەم بروسکەیە ڕەوانەکرا ،فیل حەمدیی راکردوو، دەمێك بوو دەسگیرکرابوو!!
---------------- -----------------

(*) سەلەپ:سەحلەپ: گیایەکە گوڵی جوانەو چەند جۆری هەیە.لە جۆرێکیان نۆشابەیەکی وەك چای لێ دروست دەکرێ و تامی شیرینەو لەگەڵ شیردا دەنۆشرێ(وەرگێڕ).

# کامە حزب دەباتەوە؟

گوتیان:

- مراد ئاغا هەموو شتێك دەزانێ!

کە تازە هاتبوومە ئەم ناوچەیە چەند رۆژێك میوانیماڵی مراد ئاغا بووم. ئاغام لە چایخانەدا دۆزیەوە:

- مراد ئاغا، دەڵێن جەنابت هەموو شتێك دەزانی و سەرت لە ئیشان دەردەچێ، پێم ناڵێی لەم هەڵبژاردنەدا کامە حزب دەباتەوە ؟

مراد ئاغا گوتی:

- هیچ مەعلووم نیە.

گوتم:

- کامە حزب بە تواناو لایەنگر بێ ئەو هەڵبژاردن دەباتەوە.

گوتی:

- نەخێر. مەعلووم نیە.ئەنجامی هەڵبژاردنی ئاق قۆینلوو قەرە قۆینلو دەزاندرا بەڵام ئەنجامی هەڵبژاردنی ئەم شارۆچکەیە نازاندرێ و لە هەر کێ بپرسی ، هیچی لێ نازانێ. دەزانی بۆ نازانن؟با بۆت باس بکەم..

چوار مەشقی لێی دانیشت و پێی چەپی خستە بان پێی راستی و ئاگری لە جگەرە بەرداو گوتی:

- جارێ لەم شارۆچکەی ئێمەدا حزب و میزب نیە.. ئەگەر هەبێش هەر ناوەو کەس ئاگای لە حزب نیە. جاران حزبمان بە دەوڵەت دەزانی. بینایەکی پان و بەرین و فراوان کە هی حکوومەت بوو. پاشان حزبێکی دیکە دامەزراو بوو بە هەڵلا. کامیل بەرگدروو هاتە لام و گوتی : مراد ئاغا وەرە با بەیەکەوە هۆبەیکی حزبی تازە دامەزراو لەم شارۆچکەیەدا بکەینەوە. گوتم : کورە کامیل کوڕی خۆم هۆبەی حزب دوکانی بەقاڵی نیە، بڕۆ ئیشت. رەزای پاریزەر نامەی بۆ کاربەدەستانی ئەو حزبە ڕەوانە کردبوو، هاتە لام و گوتی: خەڵکی ئەم ناوچەیە بە قسەی تۆ دەکەن وەرە با هۆبەی حزب بکەینەوە. گوتم: کورە ئێوە سەرئێشە بۆخۆتان پەیدا دەکەن ، ئەم

مەملەکەتە بە کەڵکی حزبایەتی نایە. گوتیان: زەمانە گۆڕاوەو ئێستا لە ئەمریکاشدا قانوونە دەبێ مرۆ لە حزبێکدا بێ.

درێژەی نەدەمێ، حزبمان دانا. لەگەڵ بڵاوبوونەوەی هەواڵ ، هەرچی ئەندامانی حزبەکەی دیکە هەن ڕژانە سەرمان. نووسەری حزب فریاناکەوێ ناو تۆمار بکا.ترسم گەیشتێ، کوڕە چ لەم هەموو ئەندامانە بکەین؟ بە ڕەزای پارێزەری سەرۆکی هۆبەی حزبم گوت: وەرە پیاوی چاك بە با تۆمارگە داخەین ئیدی کەس وەرنەگرین با تووشی بەڵایەك نەبین. گوتی : تووشی هیچ نابین، حزب لایەنگرو ئەندامی زۆر بن باشترە. دەبێ ئەنجام بە چ بگا، ئەوانەی لە حزبەکەی دیکەوە هاتوون حزب و میزب نازانن و کوڵەوارن؟

هەرچەندەی هاوارم کرد بێ سوود بوو. مەڵبەندی حزب سپاسنامەیەکی بۆ ڕەزای پارێزەر ڕەوانە کرد. زۆری نەخایاند گوتیان سەرۆکی گشتیی حزب تەشریف دێنێ. ئیدی دارو بەرد ڕژایە شارۆچکەو دەرزیت فڕەی ئاسمان بدابا وەعاردی نەدەکەوت.ئێمە پێمان وابوو ڕەزای پارێزەر وتاربێژی چاکە ، بەڵام ئەم سەرۆکی گشتییەی حزب ڕەزای چی و مەزای چی! وای دەهۆنایەوە خەڵکەکەی بەجارێ جۆش دەدا. وەك کۆنترۆڵی لە دەست ئەو بێ، بای دەدا خەڵکەکە دەگریان، بۆ لای دیکەی بادەدا، تێکڕا پێدەکەنین.

وتار تەواو، سەرۆکی گشتی هاتە بارەگای حزب. لە ڕەزای پارێزەری پرسیارکرد:

- سەرجەم دانیشتووانی ئەم شارۆچکەیە چەند دەبن؟

- بیست و چوار هەزار کەس.

سەرۆکی گشتی گوتی:

- ئەوانەی لە هەڵبژاردندا مافی دەنگدانیان نیە حیساو مەکە.

- ئەوانی مافی دەنگدانیان نیەو یا نایەن، بەزیادەوە یازدە هەزار نابن.

- چەند کەس لە حزبەکەی ئێوەدا نێو نووس کراون؟

- نۆ هەزار.

سەرۆکی گشتی گوتی:

- کەواتا لەم شارۆچکەیەدا هەڵبژاردنمان بردەوە.

دووا بەدووای ڕۆیشتنی سەرۆکی گشتی حزبی ئێمە، حزبەکەی دیکە کەوتنە خۆیان و ترسیان گەیشتێ و سەرۆکی گشتیی ئەوانیش هات و وتارێکی خوێندەوە، چ وتارێ!!.. بەڕاستی وتار وادەبێ..لە کۆتایی دا گوتی:

- هاوولاتییە خۆشەویستەکان.. ئەگەر حزبی ئێمە بێتە سەرحوکم ،ئەوە هەر دانیشتوویەکی گوند هەزار لیرە سلفەی بانقی دەدەینێ.

وای سلفە! ئیدی هەر ئەندامی ئێمەیەو بەراکردن لە حزبەکەی دیکەدا خۆی نێونووس دەکا.

رۆژی دوواتر رەزای پارێزەرم بینی، دەستی لە ژێر چەناگەی بوو.گوتم:

- کاکە رەزا خێرە، دەڵێی کارێژەت ژان دەکا؟

گوتی:

- ددانەکانی من تاخمن، شوکر ژان ناکەن. بەڵام لەمەیش بەدتر ، هەرچی ئەندامان هەبوون هەموویان چوونە ریزی حزبەکەی دیکە.

- کەسمان نەما؟

- هەموو ئەم قەرزەی بانق وای کرد.

گوتم:

- هەڵسە با ئێمەیش برۆین خۆمان نێو نووس بکەین، دەترسم پاشان وەرمان نەگرن!

گوتی :

- جارێ بوەستە. تەلەفۆنم بۆ مەڵبەند کردووە بزانم چم وەڵام دەدەنەوە؟

ئیدی یەك کرین و فرۆشتن لە شارۆچکەدا دەستی پێکرد هەر مەپرسە.. خەڵك پارەیان دەوێ.دەمگوت:

-کورە ئەمە چ وەزعێکە، خۆ پارەتان لە کوچەو کوڵان نەدۆزیتەوە؟

دەیانگوت:

- هەزار لیرە سلفە بەرێوەیە!

رەزای پاریزەر بە هەردوو چەپۆکی وەردەگەرایە سەری و بە نووزەوە دەیگوت:

- هەڵبژاردنمان دۆراند..

وا دەپارایەوە بەردی نەرم دەکرد.

جاریکی دیکەیش سەرۆکی گشتیی حزب فریاکەوت. هێشتا هەر پێیەکی لە نێو ئۆتۆمبیل بوو کە وتارێکی وای پێشکەش کرد خەڵکەکەی بەجارێ هەژاند. جارێ وشەی لەدەم دەرنەهاتووە ، خەڵك دەستیان بە گریە کرد،کە نوتقی کرد تێکرا دایایانە قاقای پێکەنین. وتار وا دەبێ.فەرمووی:

- هاوولاتیانی ئازیز.. لەدووای منەوە یەکێك هاتووتە لاتان وادەی هەزار لیرە سلفەی بانقی

پێداون. من وادەتان دەدەمێ ئێمە دووهەزار لیرە سلفەی بەنك بدەینە هە خێزانێك.
هەر ئەو رۆژە بووینەوە حزبی دەسەڵاتدار.. هەر خەڵکەو دووبارە خۆی نێو نـووس دەکاتـەوەو بە هەزاران رژانە ئەم ناوە. رەزای پارێزەر گوتی:
-ئەمجارە هەڵبژاردنمان مسۆگەر کرد.
نەك هەر رەزا ، بەڵکو ئەمە رای هەموو کەسێك بوو.
دیسان کڕین و فرۆشتنێکی بێ حیساب دەستی پێ کردووە..
- کورە دیسانەکێ ئەمەتان لە چی؟
دەیانگوت:
- ئەو هەزار لیرەیەی حزبەکەی دیکەمان خواردو تەواو ، نۆرەی سلفەی ئێوەیە بیخۆین!
وای لەم عەقڵەی خەڵکی شارۆچکەی ئێمە هەیانە! هێشتا پارەیان نەچووتە گیرفان سەرفی دەکەن..!
ئەمجارە سەرۆکی حزبەکەی دیکە هاتەوە:
- بە دووهەزار لیرە سلفە ئێوەیان تەفرە داوە! ئێمە نەك بۆ هە خێزانێك، بگرە هـەر سـەرو دوو هەزار لیرەی دەدەینێ..
کابرا وتاری تەواو نەکردبوو، کە بـەڕاکردن خەڵکەکـە دووبـارە لـە حزبەکـەی ئـەو خۆیـان نێونووس دەکرد.
مـنیش بڕیارم دابوو پێوەندی بە حزبەکەی دیکەوە بکەم. حزب سەرو دوو هـەزار لـیرە سـلفە دەدا ، هـەر بابایـەو پسـوولەی مـارەیی بـڕین و دەفتـەر نفـووس دەردێنـێ و نـاوی وەهمـی دادەنێن..کە پرسیارت لە یەکێك دەکردو دەتگوت بۆ وا دەکەی؟دەیگوت:
- نیشتمان رۆڵەی دەوێ.
سەرۆکی گشتیی حزبەکـەی ئێمـە پەیـدا بـوو، باشیشـی کـرد ئـەگینا ئەنـداممان نـەدەمان .. مامۆستا دووای وتارێکی گەرم و گوڕ، گوتی:
- هاووڵاتییە خۆشەویسـتەکان.حزبەکەی دیکـە وادەی دووهـەزار لـیرەی پێـداون.. ئێمـە دوو هەزارکەیش دەدەین و قازانجی سلفەیش لەکەس وەرناگرینەوە.
خەڵکەکە ئەمجارە رژانە ناو حزبەکەی ئێمە..گوتم:
- بۆ خاتری خوا کاکـە رەزا هەڵبـژاردن ئەوەنـدەی نـەماوە، ئەگـەر لـەم ماوەیـەدا سـەرۆکی حزبەکەی دیکە هات ، چارمان چیە؟
هەروایش دەرچوو، سەرۆکی حزبی دیکە خۆی گەیاندێ:

- هاوولاتییه بەڕێزەکان.. جا وەرنەگرتنەوەی قازانجی سلفه چیه؟ئێمه قازانج وەرناگرین ولە هەموو کۆنه قەرزەکانی پێشووشتانیش خۆش دەبین.
کابرا ئەمەی گوت و ڕۆیشت و وەك بارووت بخاتە نێو ئاگر،بەدووای خۆیەوە قیامەتی بەرپاکردو ڕۆیشت..
- کاکه ڕەزا چمان بەسەرهات؟
ڕەزای پارێزەر وەلامی دامەوەو گوتی:
- سوتاین مراد ئاغا، ئاگرمان تێبەربوو ..حزب قەت کەسی تێدا نەما هەموویان چوونه حزبەکەی دیکه.
- کوڕە با ئێمەیش بچین.
- سەبرکه، نامەم بۆ سەرۆکی گشتی نووسیوه، بابزانین سەرباری لەقەرزخۆش بوون ، وادەی چیتر دەدا؟
هەڵبژاردنیش ئەوەندەی نەماوه، پڕوپاگەندەیش قەدەغە کراوه. بۆخاتری خوا دوواکەوتین،سەددانه کەس لەحزبەکەی ئێمەدا نەماون، حزبەکەی دیکەیش کۆی ئەندامانی گەیشته هەژده هەزار کەس.
- باشه کاکه ڕەزا لەشارۆچکەکەی ئێمەدا ئەوەنده دەنگدەر نین ، ئەم خەڵکه لە کوێ هاتوون؟
- مەسەله سلفەی بانقه.. هەریەکەو خۆی بە دووکەس نووسیوه.
- ئەوانەی مافی دەنگدانیان هەیه چەند کەس دەبن؟
- دووازه هەزار.
- کاك ڕەزا بەخوام سپاردی، دەڕۆمه ناو حزبەکەی دیکه.
باشه؟منیش لەوێدا خۆم نێو نووس کرد.
مراد ئاغا داوای قاوەیەکی دیکەی کردو پێی ڕاستی خسته بان هی چەپ و گوتی :
- ئێستا تۆ بڵێ، حزبێك هەژده هەزار لایەنگرو ئەندامی هەبێ، ئەوی دیکه بە حاڵ بگاتە هەزار ، بڵێ بزانم کامه حزب دەباتەوه؟
- توخوا مراد ئاغا ئەمەیش بوو بە پرسیار؟ ئەڵبەت ئەو حزبەی هەژده هەزارلایەنگری هەن.
- برازا نەتزانی..نەخێر نەتپێکا..ئەو حزبەی من لێی دەرچووم هەر ئەو بردیەوه.. من خۆم دەنگم دایه ئەو حزبەو نەمدایه حزبی تازه..چۆنه؟کاکه ئیشی ئێمە مەعلووم نیه. یەکێك دووهەزار دەدا، خەڵکەکه خۆیان تورِ دەدەن، ئەوی تر سێ هەزار، جارێکی دیکە خەڵکەکە

دەڕژێنە ناوی.بەڵام گوێ مەدەرێ، هەرکاتەی وادەی هەڵبژاردن هات هەر کەسەو ڕاوتەگبیری خۆی دەکا.

گوتم:

- باشە بۆ وایە؟

- مەسەلە پارەو وادەیە. بەڵام کە هاتە سەر دەنگدان، خەڵکەکە لە هەوەڵەوە کامە حزبی هەڵبژارد بێ دەنگی خۆی دەداتێ.بۆیە ئەنجام مەعلووم نابێ. هەرکەسێك پێی گوتی دەنگت دەدەمێ باوەڕی پێ مەکە.کە پێڵاوی لە پێ کرد ئەو کاتە مەعلووم دەبێ!

برازا ، قاوەیەکی دیکە ناخۆیتەوە؟

# کەر لە وولاٌتەکەی خۆتاندا نیە؟

وەك ددانی ژان بکا، دەستێکی لەسەر چەناگەەی داناوەو بەدەستەکەی تر لە رووی خۆی دەدا:

- تفوو، بزانە چۆن رەزیل بووین !

سەرسام بووم . کابرا پیاوێکی ماقووڵە کەچی هەر لە دەرگاوەوە ئەم قسانە دەکا! گوتم:

- فەرموو فەرموو، بەخێر بێن،فەرموو دانیشە.

- رەزیل بووین ، رەزیل.

- چۆنی؟

- چۆن بم،چۆن و مۆن ما؟ ئەوە نیە رەزیل بووین؟ تفوو.

وا تێگەیشتم قەزاو بەلاٌیەکی بەسەرهاتووە، خوانەخواستە ژنی ، مندالێکی، تووشی فەلاکەت بووە.

- بەتەواوەتی شکاینەوە ، بووینە دوو پارچە.

- بۆ، چی بووە؟

- هێشتا پێی دەویٚ، پیرەکەرێکمان بە دووهەزارو پێنج سەد لیرە فرۆشتە کابرا.

کەمێك لێی دوورکەوتمەوەو دیقەتێکم دایە، خۆ شێت نەبووە؟ مەسەلەم گۆڕی:

-قاوەیەکت بۆ بێنم؟

گوتی:

- جاریٚ واز لە قاوە بێنە،رەزیل بووین.پیرەکەرێکی پەککەوتەی بیٚ نالٌ دووهەزاروپێنج سەد لیرە دەێنیٚ ؟

- بەخوا هیچ لەکڕین و فرۆشتنی کەر نازانم.

- بۆ پێت وایە من جامبازی کەرانم؟ بەلاٌم دەزانم کەرێك دووهەزارو پێنج سەد لیرە ناکا.

- جا هەر لەبەر ئەوە تووڕەی؟

- ئەی چۆن، من تووڕە نەبم کیٚ تووڕە دەبیٚ؟تۆ هیچ بیستووتە کەرێك دووهەزارو پێنج سەد لیرە بێنیٚ؟

- بیست سالٌ زیاترە کەرم نەدیوە.

- من پرسیاری ئەوەت لێ دەکەم ئاخۆ پیرەکەرێك دووهەزارو پێنج سەد لیرە دەکا؟
- بڵێم چی، نازانم..کەرێکی بە مەعریفەت بەڵکو ئەمە نرخی بێ!- بەمەعریفـەتی چـی؟کەرە کەر.سەرەرای ئەمەیش گورِو و پیر، بەدووهەزارو پێنج سەدلیرەیان فرۆشتە کابرا. لەهەموویشی بەدتر من لە نێوان ئەم کرِین و فرۆشتنەدا بووم.
- نا؟ چۆن؟
- منیش هاتووم باسـی ئەمـەت بـۆ بکـەم. لەسـەر داوەتنامـەی لەئـەمریکاوە بـۆ زانکـۆی ئیستانبوولەوە هاتبوو، خۆم و ژنم ساڵێك لە ئەمریکا ماینەوە. دەزانی وانیە؟
- دەزانم.
- لەئەمریکادا پرۆفیسۆرێکم ناسی و بووینە دۆسـت و زۆری یارمـەتی دام و چـاکەی لەسـەرم بـوو، گەگەرِامـەوە تورکیـاش نامـەمان لەیـەکتر نـەبرِی. دۆسـتی تورکیـا بـوو ، تورکیشـی خۆشدەویستن. لە یەکێ لە نامەکانیدا باس لە برادەرێکی خۆی دەکا کە پسپۆرە لـە مـافوور و دەیەوێ بێتە تورکیا. کابرا بەدووای کۆنە مافورو شتی ئەنتیکەیەو خەریکە کتێبێـك دادەنـێ. نامەی دابووە کابرا.
پسپۆرلە مانگی تەمووزدا پەیدابوو.ئـەدرەس و ژمـارەی تەلـەفۆنی مـنی لایـەو رۆژێکیـان تەلەفۆنی کردو یەکسەر چوومە ئەو هۆتێلەی لێی دابەزیوە.کابرا هەر لـە جنۆکـەی دەکـرد، ئەمریکییەکی بە ئەسڵ ئەڵەمان، وابزام جوولەکەی ئەڵەمانەو چۆتە ئەمریکا. چوار باولی پرِ لە مافووری پێ بوو کە بەرلـەوەی بێتـە تورکیـا لـە وولاّتـانی دیکـەی کرِیبوون.باولـەکانی کردنەوەو ئەنتیکەکانی نیشانی من دا.کۆنە مافوور،بەرِە،توورەگە.دیارە زۆر بە کۆکردنەوەی ئەم شتانە کەیف سازبوو.دەیگوت ئەمانە خەزێنەنە..ئەم دەپارچە مافوورانە لانی کـەم سـێ هەزار دۆلار نرخیانە.کەچی ئەو لە یەکێ لـە دێهاتـەکانی ئێرانـدا بەیـەك دۆلاری کرِیـون. سەرەرِای ئەوەش کابرای ئێرانی کە دۆلاری وەرگرتووە و بینیویەتی لە پـارەی خۆیـان ناکـا، دۆلاری تورِداوەو نەیویستووە.
پرسیاری ئەوەم لێ کرد بۆچی ئەم پارچە مافوورە کۆنانە پارە دەکەن؟ گـوتی: چـونکە لـە هـەر سانتیمیترێکدا هەشتا تەقەڵ هەن، ئەمانە شاکارن.
ئەو بەزەوقەوە باسی مافووری دەکردو زانیاریی لە بارەیەوە هەڵدەرشت. دەیگـوت :شـاکارترین مافوور سەد گرێی لە هەر سانتیمیترێکیدا هەیە، ئەویش مافوورێکی دیوارە و نـازانم لـە کـام مۆزەخانەدایە.

لبادێکی نیشان دام،ئەمەم بە پەنجا سێنت کڕیوە ..لەکەیفان حریت حریت پێدەکەنی: ئەم لبادەیش لانی کەم پێنج هەزار دۆلار دەکا.
گوتم: باشە چۆن ئەم شتە گرانبەهایانە وا بە هەرزان دەکڕی؟گوتی: چل ساڵە ئەمە پیشەی منە. ئەوەندە لە بارەی ئەنتیکەو وکۆنە مافوور دووا، هیچم پێ نەما بە غەیری ئەوەی سەرسام و واقی وڕبم.سێ دانە کتێبی لە سەر مافوور داناوەو خۆیشی یەکێکە لەوکەسانەی بە خاوەن گەنجینەی مافوور دەژمێردرێن.
بەرەو ئەنادۆل بەڕێ کەوتین .ناوچە ناوچە ،قەزا قەزا دەگەڕاین.وێنەی فۆتۆگرافی مافووری دەردەهێناو لە گەڵ مافووری مزگەوتەکانی بەراورد دەکردن و تێبینی تۆمار دەکرد.چەند پارچە کۆنە مافوورو بەڕەو لبادیشی کڕی. بەقسەی خۆی ئەو شتانەی لێرەی کڕین هیچی وانیە بەرامبەر ئەوشتانەی لە هیندستان وئەفگانستان وچین وترکمانستان و ئێراندا کڕیونی: - مافووری زۆر بە قیمەت لە ترکیادا هەن،بەڵام تەسادوفی ناکەین.
چووینە ناوچەیەك دوو دەستەی ئەمریکی و ئەڵەمانی بەدووای ئاسەوار عەردیان هەڵدەکەنی.لە پانتایی پێنج دە کیلۆمیتر چادریان هەڵدابوو.خاکیان سەراوبن کردبوو.چیا، گرد، وەك پەمۆی هەللاج پەرەیان کردبوو.خۆلیان لە گردەکان دامالیبوو.ئێرە بەر لە حەزرەتی عیسا ئاوەداون بووەو لەژێر خاکدا شوێنەواری خانوو و گۆرستانیان دۆزیوەتەو.
لەبەر ئەوەی شوێنێکی کۆن و مێژوویی یە، ئەوانەی هەوەسی شتی کۆن دەکەن پەیتا پەیتا دەرژێنە ئەم ناوەو لە هەر سێ چوارکیلۆمیتردا دەیان توریست دەبینی.خەڵکی دیهاتیش پڕی ئەم ناون و ئەو پارچە گۆزانەی لەژێر خاکی دەدۆزنەوە دەیفرۆشنەوە ئەو خەڵکە بیانیانەی وا گەشت و گوزار دەکەن.ئەوانیش دەیقۆزنەوە. منداڵە دێهاتی پەیتا پەیتا دەخولێنەوەو ئەو شتانەی لەژێر خاکیان دۆزیونەتەوە دەیفرۆشنەوە: تاشەبەردی هەڵکەندراو،گوڵدانی شکاو.کوڕو کچی بچکۆڵانە هەرایانە: وان دۆلارو بەرەوپیلی گەشتوگەوزارگەران رادەکەن .
لەدڵی خۆمدا گوتم با منیش شتێك بۆ یادگاری بکڕم.قوڵپی گوڵدانێکم وەدەست کیژوولەیەکی قژزەردی دە ساڵان بینی و تەپلە سەرێکیش لە بەردی شین تاشراو بە دەست کوڕیژگەیەك بوو. وای بۆچووم کە رەنگە بەردەکە لەو بەردە بەنرخانە بێ کە دەگەڵ زێڕوئەڵماسی بکاردێنن.گوتم:
- منالینە ئەمانە بایی چەندن؟
کچە داوای چل لیرەی کردو کوڕە پازدە لیرە.گوتم با هەرزانتری بکڕم:
- ئۆی ، گرانە.
کوڕەو کچە لە چەشنی مرۆڤی بەساڵا چوو، دەستیان بە شەرح کردنی شتەکانی خۆیان

کرد، گوتیان باوکمان چەند ڕۆژ خەریك بووە تا لـە ژێـر قـوولاّیی پێـنج مـیتر زەوی ئـەم شتانەی دۆزیوەتەوە.

لـێم کـڕین ، بـەلاّم دۆسـتی ئـەمریکیم ئـەم شـتانەی نـە بـە مێـژوویی و نـە بـە ئاسـەوار دانا.گوتی :خەڵکی ئێرەیش وەکو خەڵکی تەواوی ڕۆژهەلاّت ئەم شـتە تەخلیتانـە دەفرۆشـنەوە بێگانە.هەرچی لە ماڵەکانیاندا هەن ژنانـەو پیاوانـە ،قـۆڵی بیگانـەی پـێ دەبرن.ئەوەنـدە لـە تەخلیت کردن زیرەکەن ، کە ئەگەر شوێنەوارناسی بەڕاستی نەبێ دەرکی پێ ناکا.بۆ نموونە ئـەو قولّپە مەرکانەی دەست گیژۆلەو کەللەسەری لـەبردی شـین تاشـراوی دەسـت کوڕیژگـە هونـەر نیە؟تەنانـەت ئەوگوندنشـینانە ئێسـقانی سـەگێکیان فرۆشـتبۆوە کابرایـەکی ئـەمریکی بـەو حسێبەی ئێسقانی مەلیکێکی مۆمیا کراوەو حریت حریت پێدەکەنین.

بە سواری جیب بە ڕێگەی قیرنـەکراودا دەڕۆیشـتین و دنیـاش زۆر گـەرم بوو.دووسـێ درەخـتی چنارمان لە نزیك گوندێکەوە بەر چاوکەوت، لاماندا ژێر درەختەکان ژەمی نیوەڕۆ بخۆین. پـیرە پیاوێك لەو ناوە دانیشتبوو، کەمێك دوورتریش کەرێکی بەستبۆوە.سـلاّومان لـە کـابرا کـردو دەستمان بەقسە کردو قسەکانم بە ئینگلیزی لە دۆستە ئەمریکیەکەم دەگەیاند.

- ئەم گوندە کام بەرهەمی لە هەمووان پترە؟

گوتی:

- هیچ بەرهەمێکی نیە.جاران تۆومۆ دەکـراو دەخـڵ و دان هەبوو.بـەلاّم لەوەتـەی دەسـت بـە هەڵکەندنی شوێنەوار کراوە، بیست ساڵیش دەبێ هیچ ناچاندرێ.

کابرای ئەمریکی گوتی:

- لە جێگەی دیکەیشدا هەر هەمان شتە.

گوتم:

-ئەی باشە ئەم خەڵکە بە چ دەژین؟

- پارچە گۆزەو بەردو کۆنە شتی ژیر خاك بوو بە مۆدە. خەڵکی وازیـان لـە زەراعـەت وئـاژەڵ بەخێوکردن هێناوەو کەوتوونەتە دووای زەوی هەڵکەندن و ئەو شتانەی دەدۆزنـەوە دیانفرۆشـنە بیانیان و پێی دەژین.

کابرای ئەمریکی:

-لە جێگەی دیکەیشدا هەمان شتە.

پیرە پیاو گوتی:

- خەڵکی ئێرە زۆر ناڕەسەن وهیچ و پووچن.هەرچی گەنجینەی ئەم ولاّتـە هەیـە بـە بیگانـەیان

فرۆشت.هەرچی لە ژێرخاکەوە دەریان هێنا هەرزان فرۆش کران و بەخۆڕایی لەناویاندا. هەموویان دزن.باش بوو حکوومەت فریاکەوت ،ئێستا نایەڵێ کەس هیچ دەربێنێ و ئەگەر بێگانە شت بکڕن ئەوە لە حکوومەتی دەکڕن.
کابرای ئەمریکی گوتی:
-ڕاستە، لە جێگەی دیکەیشدا هەر هەمان شتە.
گوتم :
- باشە خەڵکی گوند بە چ دەژین؟
-ئەم ناوچەیە شەش گوندی لێ یە، بڕۆ ماڵەکانیان هەرچی شتە نایدۆزیەوە، ئەوەی قیمەت بکا نەماوە.پەرداغ، گوڵدان،سنی..هەموویان خاوە ن ماڵێکی چۆڵ وبەتاڵ.
- بۆ؟
- بۆ؟ چونکە فرۆشتوویانە توریستان، هیچیان لە ماڵدا نەماوە.هەرچیان هەبێ بە ئەنتیکەو ئاسەواری دەفرۆشن. داب و نەریتی خەڵکی ئێرە بە جارێ شێواوە.دوێنێ تەماشا دەکەم وا مێرد منداڵێك خەریکە مۆرو لە ملی کەرەکەی من دەکاتەوەو دەیدزێ.کەدزیشی دەیبا لە ژێر خاکی دەشارێتەوەو پاشان دەریدەهێنێ کە بەڵێ ئاسەواری دۆزیتەوە! تێگەیشتن چۆنە؟ بارگەو بووکێنی کچەکانی گوندیش نەمان، هەموویان بە ئەنتیکەو ئاسەوار فرۆشت،بەردێکی لە پەنجە درێژتر شتێکی لێ دروست دەکەن.نالی کەر دەکەنە میدالیاو کۆنە پارە.
کابرای ئەمریکی:
- نەمگوت؟ لە جێگاکانی دیکەیشدا هەرهەمان شتە.
پرسیارم لە پیرەپیاو کرد:
- ئەی تۆ بەچ دەژی؟ چکارەی؟
گوتی:
- کەر دەکڕم و دەفرۆشم.
پاشان ئەو بڕە ئاوەی لە گوند هێنابووی لەبەردەم کەری دانا، کەر خەریکی ئاوخواردنەوە بوو ، کابرای ئەمریکی هەڵسایە سەرپێ و بەرەو لای کەر ڕۆیشت.ئێمەیش خەریکی قسان بووین:
- جا بازرگانیی کەر خێری هەیە؟
- لەخوا بەزیاد بێ، پێنج ساڵە ئەم کارە دەکەم.
- باشە چەند قازانج دەکەی؟
- مەعلووم نیە، بەگوێرەی کەرە.

- بەچەند ساتە وەخت کەرێك دەفرۆشی؟
مەعلووم نیە.جاری وا دەبینی سێ مانگ،پێنج مانگ کەر نافرۆشرێ.. جاری وایش هەیە لە ڕۆژێکدا پێنج دانە کەر بەجارێك دەفرۆشرێن.
کابرای ئەمریکی لێم نزیك کەوتەوەو گوتی:
- پارچە مافوورێك وەبان کەرەکەیەو هەیە،هەر مەپرسە!
تەماشام کرد، پارچە مافوورێکی لەقوڕ وەردراوە..گوتم:
- ئەم پارچە پیسە؟
گوتی:
- ئەمان، ئەمە شاکارە.ئێوە خەریکی قسان بوون من پارچە مافوورم هەڵگێڕو وەرگێڕ کرد.. ڕەنگی ،هەرمەپرسە .لەهەر سانتیمیترێکیدا سەدو بیست گرێ هەیە. شتی وا عەجایەب لەم دنیادا نیە.دەگمەنە.
گوتم:
ئەگەر بیفرۆشێ کریاری؟
- بەڵێ کڕیارم.بەڵام با کابرا نەزانێ کڕیاری مافوورم.من ئەمانە چاك دەناسم،شتێك فڕێی بدەن ،کەتۆ ویستت بیکڕی یەکسەر خۆیان گران دەکەن و دڵێن دیارە بەقیمەتەو ئەنتیکەیەو داوای پارەیەکی یەجگار زۆر دەکەن.چاویشیان تێر نابێ هەرچەندەی بیاندەیێ لایان وایە کەمە. بۆیە با کابرا تێ نەگا.
کابرای دێهاتی بە جواب هات:
- ئەم گاورە چ فینگە فینگیەتی؟
گوتم:
- هیچ ، ئێرەی زۆر بە دڵە.
- جا ئێرە چی لێیە بەدڵی بێ؟ گردێکی رووت و قووت.
کابرای ئەمریکی:
- پێم نەگوتوی ؟ ڕێگەی ئاسان هەیە شت بە هەرزان بکڕم. ئێستا ئەو ڕێگەیە بەکاردێنم.
- چۆن؟
- هەوەڵ خۆمان لە مافوور نادەین ،کەرەکەی لێ دەکڕین . کابرای دەشتەکی بیری بۆ نرخی مافوور ناچێ. کەپێکهاتین پارچە مافوور لە سەرپشتی کەر دەبێ ، ئینجا ئەویشی بە نرخێکی

هەرزان لێ دەکڕین. تۆ ئێستا مامەڵەی کەری لەگەڵدا بکە.
بە کابرای پیرەم گوت:
- جەنابت کەر دەفرۆشی، وانیە"
گوتی :
- بەڵێ.
- باشە ئەم کەرە بە چەند دەدەی"
- دەمێنتە سەر کڕیار چەندی پێ دەدا.
- ئەگەر ئێمە کڕیار بین؟
کابرا پێکەنی:
-پێم رادەبوێرن؟پیاوی وەك ئێوە ئەفەندی و پۆشتە کەرتان بۆچیە؟
-تۆ هەقت چیە، ئێمە دەیکڕین. بەچەندی دەدەی؟
-کڕیار دەزانێ. تۆ دەیکڕی یا ئەم گاورە؟
-ئەو دەیکڕێ.
- چ میللەتە؟
-ئەمریکییە.
- هممم..بیانی نیە، لەخۆمانە. برا ئەم پیرەکەرە بەکەڵکی ئەو نایە.
لەکابرای ئەمریکیم گەیاند،گوتی:
-زۆر باشە، کەواتا هەرزانی دەدا.
بە پیرەمێردم گوت:
- پیرە کەریش بێ،ئەو رازیە.
- کاکە شوورەیییە. دەچێتەوە ئەمریکاو گلەمان لێ دەکاو دەڵێ تورك قۆڵیان بڕیم.
لە دۆستی ئەمریکیم گەیاند، گوتی:
- دێهاتی تورك زۆر دڵسافن. راستگۆنە.لە شوێنێکی دیکـە بووایـە ئەسـڵەن نەیاندەفرۆشـت.
مادام ئەوەندە پیاوێکی دڵسافە منیش پارەی چاکی دەدەمێ.
گوتم:
- ئەمریکی رازیە.

- باشه ،بەڵام بەگم ئەم کەرە ناگاتە ئەمریکا، لە ڕێگەدا دەتۆپێ! ئەم کەرە گوڕوە.
- بەتۆ چی برا؟ کابرا دەیەوێ.
- هەللا هەللا..برا خۆ ئەمە جاشەکەر نیە ئیشێکی بۆ بکا، چ لەم کەرە گوڕوە دکا؟
-تۆ هەقت چیە؟ تۆ پارەی خۆت وەربگرە. . ئێستا بەچەندی دەدەی؟
- دێهاتی گوتی:
- وەڵڵاهی زۆرم مەراقە.بەم مامۆستایە ئەمریکی یە بڵێ: کەر لە وڵاتەکەی خۆیاندا نیە؟
پرسیارم لێ کرد
- کەر لە وڵاتەکەی خۆتاندا نیە؟
گوتی:
- هەیە بەڵام وەکو ئەمە نین.
لەکابرای دێهاتیم گەیاند.گوتی:
- هممم..دیارە ئەمریکی مەراقی کەری تورکانە! چبکەم ئۆباڵ بە ئەستۆی خۆی . من تەواوی عەیبەکانی کەرم پێگوت. ئێستاش بۆ کەرێك دڵی دۆستێکی بێگانە ناشکێنم. با بیفرۆشین.
-بەچەند؟
- بۆ ئێوە بە یازدە هەزار.
-چی؟ کابرا تۆ شێتی؟ ڕەسەنترین ئەسپی عەرەبی بە دوو سێ هەزار لیرەیە..
-کەواتا کەرتان بۆچیە؟ بڕۆن ئەسپی ڕەسەن بکڕن.
لە ئەمریکیم گەیاند..گوتی:
-چیم گوت؟ کە کڕیار بووی داوای پارەی زۆر دەکەن . ئەگەر مامەڵەی مافووری سەرپشتیمان بکردابا ڕەنگە داوای سەد هەزار لیرەی کردبا! ئێستا من دە هەزار لیرەی پێ دەدەم بەڵام یەکسەر ڕازی بم داوای پەنجا هەزار دەکا. با مامەڵەی لەگەڵدا بکەین.
-بە مامە پیرەم گوت:
-ڕاستم پێ بێژە، تۆ ئەم کەرەت بە چەند کڕیوە؟
-من درۆم لانیە.دەسنوێژم هەیەو درۆ ناکەم.ئەم کەرەم بە پێنج لیرە کڕیوە. چاوەڕی بووم ئەمڕۆ سبەی بتۆپێ و کەوڵی بکەم. لەمە زیاتر بەکەڵکی هیچ نایە.
-کوڕە ویژدان..کەرێکت بە پێنج لیرە کڕیوە، چۆن داوای یازدە هەزار لیرە دەکەی؟
-برا خۆ من فرۆشیار نەبووم، ئێوە خۆتان کڕیارن.دەڵێم پیرە..دەڵێن قەیدی ناکا.دەڵێم

گـورِوە.دەڵێن رازین.دەڵـێم جاشـەکەرنیە هـەر رازی بوون.ناگاتـە ئـەمریکاو دەتۆپێ.گوتتـان باشە.ئێستا پێتان دەڵێم کەر قاچێکیشی شەلە.
-قەیدی ناکا.
-بزانە؟دیارە کەرێکی بە قیمەتەو من نازانم.ئەگینا ئەم ئەمریکی یە گاورە ئەم نێرەکەرە شـەل و پیرو گورِوەی بۆچیە؟ لە دەهەزار لیرە کەمتری نادەم.
بە دۆستی ئەمریکیم گوت:
-نایەتە خوارەوە.دەهەزاری بدەینێ؟
دوو سەعاتی تەواو مامەڵەمان کـرد.وەك نیمچـە پێـك نـەهاتنێکیش دوور کەوتینـەوە. پاشان گەرِاینەوە.
کابرا گوتی:
-دەمزانی دێنەوە؟
گوتم:
-چۆنت زانی؟
گوتی:
-چۆن نازانم؟ بیر لە کەرِینی پیرە کەرێکی وا بکەنەوە،نارِۆن.
شۆفێرمان تێگەیاند لەجادەی قیرتاو چاوەرِوانمان بێ، پاشان کەر سواری جیب دەکەین.
قوربان، هەرچۆنێکی بێ ،کەرمان بە دووهـەزارو پێـنج سـەد لـیرە لێ کرِی.پارەمـان ژمـاردو دامانێ.ئەویش رەشمەی لە دەستمان نا وگوتی:
-دەی خێری لێ ببێنن.
دووابەدووای ئەم قسەیەی گوتی:
-بەهەرحاڵ پیرە کەرەکەمان هەرزان فرۆشت. دەی پیرۆزتان بێ.
پسپۆری ئەمریکی چاوی برِیوەتە پارچە مافووری دەست کابرا..گوتی:
-با کابرامان تێ نەگا. کەر کەمێك لێدەخورِین و دوور دەکەوینەوەو دەگەرِێینـەوەو دەڵێین،ئـەم پارچە بەرِەمان بدەرێ لەسەر پشتی دانێین گەرمایە. با تێنەگا پارچە مافوور بە قیمەتە.
جڵەوی کەرمان گرت و دوور کەوتینەوە. من لە پێشەوەو پەت رادەکێشم و ئەمریکی لـەدوواوە پاڵ بەکەر وەدەنێ. بەهەزار ناڵی عەلی بیست سی پێ رۆیشتین کە لـە ناکـاو کـابرای دێهـاتی بانگی کردین:

-بوەستن بوەستن ، شتێکتان لەبیرکرد!
وای لەم کەیفە ! کابرا پارچە مافوورمان بۆ دێنێ! بەڕاکردن هاتە لامان:
-کوڕینە، سککەتان لە بیرکرد.تا دەگەنە ئەمریکا کەر لەچ دەبەستنەوە؟ کەس کەری بێ سککە دەکڕێ.چیە ئێوە خەشیمن؟
سککەی ئاسنیشمان لێ وەرگرت.
دۆستی ئەمریکیم گوتی:
-دەی کاتی هاتووە، داوای پارچە مافوور بکەو بڵێ ئەم پارچە بەرە پیسەش بێنە بە کابرای دێهاتیم گوت:
-ئەم کەرە زۆر لاوازە بەرگەی گەرما ناگرێ. پارچە بەڕێکی کۆنی پیسی لەسەر پشت بوو ، بێنە بادابنێینەوە.
گوتی:
-نا..مافوور نادەم. ئێوە کەرتان لەمن کڕیوە نەك مافوور.
-بەڵێ کەرمان کڕیوە .بەڵام ئەم پارچە مافوورەی لەسەرپشت بوو. پاشان ئەم پارچە کۆنە پیسە بۆچی باشە؟
- راست دەکەی کۆنە، پیسیشە، پارەیش ناکا،بەڵام نایدەم.
- بۆ؟
- قوربان نایدەم .ئەمە یادگاریی باوکمە .لەباپیرەمەوە بۆی ماوەتەوە چۆن دەیدەم؟ نایدەم.
بە کابرای ئەمریکیم گوت:
- دەڵێ نایدەم، یادگاری باوکمە.
گوتی:
- پێی بلی بەکەڵکی چی دی؟
کە بەکابرای دێهاتیم گوت..ئەویش وای وەڵام دامەوە:
- بەکەڵکی چیم دی؟ دەچم پیرە کەرێکی گوڕوی دیکە پەیدا دەکەم، بە هیممەتی خوا یەکێکی وەکو جەنابتان دالغەی لێ بداو بیەوێ ،ئەوە دیفرۆشمەوەو دووعانەی لێ قازانج دەکەم .ئەم مافوورە بەنرخە نرخ . سککەی ئاسنم بەخۆڕایی نەدانێ؟ هیچم لێتان ویست؟
- دەبا پارچە مافووریشت بە دوو قرۆش لێ بکڕین و کەری بەسەزمانی پێ داپۆشین.
- ئەوە فرۆشتم.ئەی پاشان چۆن کەر بفرۆشم؟ شەش ساڵە بەم مافوورەوە پیرە کەری گوڕو

دەفرۆشم..دەی خوا حافیزتان بێ، خێری لێ ببێنن.
کابرا چەند هەنگاوێك دوورکەوتەوەو گوتی:
- دەزانم کەر جێ دەهێڵن. جا بۆخۆتان ماندوو دەکەن؟ هەر ئێستا جێی بهێڵن.
پسپۆری مافوور گوتی:
- لە شوێنی دیکەدا شتی وانیە.قەت شتی وام بەسەر نەهاتووە.
کەرمان جێهێشت و بەرەو جیب رۆیشتین و سوار بووین. ئەمریکی سککە ئاسنی بەدەستەوە گرتووەو فڕەی نادا.گوتم:
- ئەم قازوخە ئاسنەت بۆچیە؟
گوتی:
- بۆ یادگاری لەگەڵ مافوورەکانی دیکەی هەڵدەگرم.قازوخێکی بە نرخە بەدووهەزارو پێنج سەد لیرە زۆر هەرزانە!
برادەرەکەم بەمست وەرگەڕایە دەموچاوی خۆی وگوتی: ئای چۆن رەزیل و سەفیل بووین!!

---

تێبینی
ئەم چیرۆکەو ئەوانی لە دووای ئەو دێن، کاتی خۆی لە گۆڤاری(باریش)ی سەر بە وەزارەتی رۆشنبیری هەرێمی کوردستان دا بڵاوکراونەتەوە .

# کۆمپانیای کەرستەی یەدەگ

کاتێکی زۆرم بێ ئیشوکار بەسەربرد..رۆژێکیان لەوکاتەی وەبان پەردێکدا دەپەڕیمەوە بیرۆکـەی خۆ کوشتنم بۆ هات.. لەبەر خۆمەوەو بە دەنگێکی بەرز دەمگوت ئایا خۆکوشتن ئازایەتییە یا کاری ترسنۆکانە؟ کە لەناکاو یەکێك توند مەچەکی گرتم و گوتی:

-ئەوە شێت بووی نووری؟

کۆنە برادەرێکی قوتابخانەبوو، ناوەکەیشیم وەبیر نەماوە:

-بەخوا نازانم ، شێتم..ئاقڵم..

بەدەم رێگاوە پرسیاری لێکردم:

-ئێ، ئێستا خەریکی چی؟

-هیچ .. عەتتاڵ بەتتاڵ.. دوو ساڵی رەبەقە هـەموو بـەیانیان کاتـژمێر هەشـت لـە ماڵـەوە دەردەچم و تا نۆی ئێوارە بەدووای دۆزینەوی کارم ..

-کارکردن زەحمەتە..

-زەحمەت بێ ئاسان بێ، پێویستم بەکارکردنە . سەردانی تەواوی دایەرەکانی ئیستانبووڵ هـی حکوومەت و کەرتی تایبەتم کردووە. وەڵامیان هەر ئەوەبووە: ناوو ئەدرەست جێ بهێڵە پاشـان خۆمان ئاگادارت دەکەینەوە ..

-مانگانە سێ سەد لیرە باشە؟

-گاڵتەم پێدەکەی؟

-پێشم کەوە..

سـواری تـە کسـی بـووین و لەبـەردەم بینایـەکی گـەورە دابـەزین ، لـەبان شووشـە نوسرابوو(نووسینگەی فرۆشتنی سپێر پارت) و لە نووسینگەیەکی فراوانی نهۆمی بانەوە وەژوور کەوتین.

دۆستەکەم گوتی:

-دەزانی سەیرم بە حالی تۆ دێ.. تۆ تەمەڵترین قوتابی بووی و ئەوەی ئەرکە جێبە جێت نەدەکردن و دواناوەندیت بە زەحمەت تەواو کردو نەچوویتە زانکۆ، سەرە ڕای ئەوەی کە زۆریش دەبەنگ بووی، کەچی بەم هەموو سیفەتانەوە نەبوویتە خاوەن کار!

گوتم:

-بەخوا بڵێم چی، لەوانەیە کەموکورتی لە درەستبوونمدا هەبێ!

-ئەم دوکانەی کەلوپەلی یەدەگ ملکی خۆمە.

-کەلوپەلی یەدەگ یانی چی؟

-کورتکراوەی کۆمپانیایەکی تورکیی پشکدارە.

-جا شەریکت هەن؟

-نەخێر .بەلاّم بۆ ئەوەی ببێتە کۆمپانیا دەبێ پشکدار بێ بۆیە ناوی ژنم و خوشکەکەیم تێدا نووسیوە.خۆت دەزانی خەلّك زیاتر متمانە بە کۆمپانیا دەکەن نەك بە دوکان..مەسەلەی باجیش ئەوە هەندێ ئاسانکاری هەیە، پاشان خوت لێیان تێدەگەی.

گوتم:

- باشە چ دەفرۆشن؟

- هیچ!

- چۆن؟

- دیارە هیچ نافرۆشین..تەماشای رەفەکانی ئەم نووسینگە پان و بەرینە بکە هیچیان لەسەرە؟ لەراستیدا هیچیان لەسەر نەبوو.لەم هۆڵی وا زەلام تەنیا هەندێ گوڵی گەلاّپانی نێو مەرکانم بینین.

-ئەم کۆمپانیایەی من پێنج دانە لقی لە ئەدەنەو قۆنیاومەلاتیاوئیزمیرو ئەنقەرەدا هەیە. ئەگەر ئامادەی کارێکی وادەکەم ببیتە بەڕێوەبەری یەك لەو لقە نوێیانەی تەمام وایە بیانکەمەوە.جارێ وەك سەرەتا مووچەت سێ سەد لیرە دەبێ و بەرە بەرە زیا دەکا تا دەگاتە هەزار لیرە.

-جا کاری من چ دەبێ؟

لە یەکێ لە چەکمەکانەوە دەفتەرێکی گەورەی دەرهێنا:

- لەم دەفتەرەدا نێوو نرخی هەموو سپێرپارتەکان دیاری کراوە.

دیقەتی یەکەم لاپەڕەمدا، نووسرابوو: کابرێتە، میلی سەرەکی، قایشی ماکینە، خەرماشە، گاردن..)

- دەتوانی هەر لە ئێستاوە دەست بەکار بی.

دابەزینە نهۆمی یەکەم، کابرایەك وەبان مێزێکی دارگوێزی رێکوپێك وەستا بوو:
-سایم.. ئەمە کاکە نوورییە.
دووای تەوقەکردن وچاك وچۆنی، پێی گوت:
-نووری لای ئێوە راهێنان دەکا.
چاوەکانی خۆم کردنەوە تا بە چاکی فێری پیشەکە ببم.سایم جگەرەیەکی دامێ هێشتا تەواوم نەکردبوو، کە دوو زەلامی دەشتەکی وەژوور کەوتن:
-سەلامەلەیکوم..
-ئای بەخێربین فەرموون دانیشن.
-سپاس کاتی دانیشتن نیە زۆر پڕکارین.
-وابزانم هۆیەکەی تەراکتۆرە.
-ئەرێ وەڵڵا دەق خۆیەتی..شەفتی شکاوەو ئیشوکارمان پەکی کەوتووە، ئاخۆ دەستمان دەکەوێ؟
- ئای بەداخەوە.. دانەیەکمان هەبووهەمووی پێنج دەقیقە نابێ فرۆشتمان! خۆزگە زووتر دەهاتن..
یەکێك لە زەلامەکان گوتی:
-ئای لەم شانسە..و شەقێکی خێواندە ئەژنۆی..
-پێموایە لای یەکێك دەست دەکەوێ.ئەگەر نەیفرۆشتبێ باشە..
-قوربانە سۆراخێکمان بۆ بکە.
-باشە پارەکەی بدەن و دووای دوو رۆژی دیکە وەرن شفت وەربگرنەوە.
-ئای بەرخوداربێ. خوا مووەفەقت بکا .پارەکەی چەندە؟
-بەخوا وەکو پێمگوتن ،بەر لە پێنج دەقیقە بە بیست وپێنج لیرەمان فرۆشت. ئەگەر لای خۆمان بووایە ئاسان بوو..
-کاکە بە هەرچەندێك بێ دەمانەوێ،ئەی خۆ کارەکانمان ناوەستێنین؟
- کابرای شفتی لایە پیاوێکی پوولەکی و بێویژدانە..نازانم ئاخۆ بە دووسەدو پەنجا لیرەی دەدا یا نا؟
زەلامە دەشتەکییەکان چرپە چرپێکیان لە گەڵ یەکتردا کردوو دووسەدو پەنجا لیرەیان داو رۆیشتن.
-خوا حافیزتان بێ.
ئەوەندەی نەبرد دەشتەکییەکی دیکە وەژوور کەوت:

-زمانەی خەرماشەتان هەیە؟

-نەخێر هی ئاوێنەمان هەیە..

-پێویستم بە هی خەرماشە هەیە..

-حاڵی حازر نیمانە.. دانەیەك لای پیاوێکی بێویژداندا هەیە، بەلاّم داوای پارەیەکی زۆر دەکا.

-چەندی دەوێ قەیدی ناکا.. تەراکتۆر یەك حەفتەی تەواوە پەکی کەوتووە.

-سێ سەد لیرە جێبهێڵە بەڵکو رازیمان کرد.ئەگەر داوای زیاتریشی کرد ئەوە خۆمان دەیخەینە بانی و پاشان لە تۆی وەردەگرینەوە.

کابرا سێ سەد دانە لیرەی ژماردن.

-سبەینێ سەرێکمان لێبدەرەوە.

کابرا دەرچووە دەرەوە یەکێکی دیکە هاتە ژوورەوەو گوتی:

-زمانەی ئاوێنەتان هەیە؟

-نەخێر نەمانەوە، زمانەی خەرماشەمان هەیە..ئەوەی تۆ دەتەوێ هەر ئێستا فرۆشتمان..

هەر کەسەی داوای شتێکی دەکرد دەیگوت نیەو ناوی شتێکی دیکەی دەگوت هەمانە..

-قۆڵی مەنگەنەتان هەیە

-مەنگەنەمان هەیە ، ئەوەندە نابێ قۆڵەکەیمان فرۆشت..ئەگەر دەتەوێ بۆتی پەیدا دەکەین بەلاّم لای کابرایەکی بێویژدانەو داوای پارەیەکی زۆر دەکا..

یەکێك دەڕوا یەکێکی دیکە دێ و پرسیار دەکا:

-زنجیری کێشانی دوواوە هەیە؟

-ئەوەندە نابێ فرۆشتمان.

-قایش پانکەتان هەیە؟

-قایشی ماکینەمان هەیە، بەلاّم ئەگەر دەتەوێ بۆت پەیدا دەکەین.کابرای دەیفرۆشێ بێویژدانەو بە نرخی بازاڕی ڕەشی دەدا..

ئەوەی دەهات پارەی دەدا. پارەیش لە نێوان سێ سەدو پێنج سەد لیرەدا بوو.

کابرایەکی دەشتەکی وەژوورکەوت:

-ئەرێ گاسنی داوام کردبوو نەگەیشت؟ پێرێ دووسەدو پەنجا لیرەم دا..

سایم وەلاّمی دایەوە:

-پەیدامان کرد بەلاّم بەهەزار تکاو نزا بە سێ سەدو پەنجا لیرە رازیمان کرد.

کابرا سەد لیرەی دیکەیش دا.سایم لە کرێکاری بەر دەستی راخوڕی:
-بڕۆ گاسن لای وەستا خەپە بێنە.
هەرکە یەکێك بۆ کەلوپەلی بەڕاداندراو دەهاتەوە یەکسەر سایم کرێکاری دوکانی ڕەوانەی لای وەستا خەپە دەکردو و ئامێریان دەدایێ!!
تاقی ئێوارە دۆستی خاوەن کۆمپانیا هات و پرسیاری لێکردم:
-ها ئیشوکارەکانت چۆن بینی؟
-زۆر باشە.
-خۆ بەچاوی خۆت بینیت کە ئێمە لێرەدا هیچ نافرۆشین، کەچی دەبێ هەموو رۆژێك و بەر لە دوکان داخستن لانی کەم سێ تا پێنج هەزار لیرە قازانج بکەین و تۆمارەکانیشمان تا بلێی خاوێن وبێ خەشن.وانیە کاکە سایم؟
-بەڵێ گەورەم وایە..
-ئێمە ئەم کەرستانە لە تۆمارگەدا بە نرخی ئەسڵی تۆمار دەکەین و هەموو وەسڵەکانمان یاساین..کاکە نووری لە کاری ئێمە گەیشتی؟ دەتوانی دەست بەکاربی؟
-بێگومان تێگەیشتم.. دەتوانم هەر لە ئێستاوە پێی هەڵسم..
-دەی با بزانین..
یەکسەر لەگەڵ کابرایەکی دەشتەکی دەستم پێکرد:
-فەرموون ئاغا فەرموون..
-قایش پانکەتان هەیە؟
-ئای بە داخەوە دانەیەکمان هەبوو فرۆشتمان.. ئەگەر دەتانەوێ قایشی پانتۆڵمان هەیە.. سەبرکەن بزانم نیمانە.. با دانەیەکمان ماوە..
-نرخی چەندە؟
-لە نرخ مەپرسن.. ئەسڵەن شەرم دەکەم..خاوەنە گەووادو بێویژدانەکەی داوای پارەیەك دەکا بەقەد مارەیی دایکی دەبێ..کابرایەکی بێشەرەف و بازرگانی بازاڕی ڕەشە، وەك پیاز پاك بکاتەوە ئاوایش خەڵك رووت دەکاتەوە..دەك خوا لەناوی بەرێ.
هەرچەندەی کابرای دەشتەکی سەد لیرەی دا ،بەلاّم من لە سەرجنێودان بەردەوام بووم:
-گاوری ئیمانسز..قایش پانکەیەك بە سەد لیرە؟چارچیە کەوتینەتە بەر دەست شەلاتییەکی سەگی کوڕی سەگ..نە مانای رەوشت دەزانێ نە دین و ئیمانی هەیە.

دەشتەکی سەددەقی لە قسەکانمدا و گوتی: راست دەکەی ..ورۆیشت.
کاتێك خۆم ئامادە دەکرد بەدووای ئـەوەوە برۆمــە دەرەوە، چـونکە گومــانم نـەبوو دۆســتەکەم وەدەرم دەنێ..کەچی رووی تێکردم وگوتی:
-ئەی ئافەرین..ماشەڵلا کە مرۆڤێکی لێهاتووی. بەیەك دانە رۆژ فێری پیشــەکە بــووی.منیش لە ئێستاوە وا مووچەکەتم کردە پێنج سەد لیرە.
شەش مانگ لە کۆمپانیای سپێرپارتدا کارم کرد تا مانگانەم گەیشــتە هــەزار لیرە.بــۆ ئــەوەی هەزار لیرەکە حەلاڵ بکەم لە بەیانییەوە تا ئێوارە کارم دەکردو جنێوی ناشیرینم بە دایك و ژنــی دۆستم دەدا. هەر جارەی گوێی لێ دەبوو،دەستی دەخستە سەر شانم و دەیگوت:
-ئافەرین.. بەڕاستی تۆ ئەو کەسەی دەمێك بوو بەدووایدا دەگەڕام!

# ماڵەکەی سەرسنوور

دوو رۆژ بوو چووبووینە نێو خانووی تازە. لەدەستەراستماندا ماڵی دراوسێیەك دەڕوانێتە ماڵەکەی ئێمە. بە کولاّندا تێپەڕ دەبووم کە کابرایەکی پیر لەو ماڵە سەری دەرهێناو بێ سەلام و کەلام، گوتی:

-ئەم خانووەتان نەگرتبا باشتر بوو!

دیقەتێکی پڕ لە مانای پیرە پیاوم داو گوتم:

- وەکو بزانم کە کرێچییەك تازە بێتە گەڕەك، دروارسێکان دسەردانیان دەکەن و دەڵێن: بەخێر دانیشن نەك وەکو جەنابت : ئەم خانووەتان نەگرتبا باشتربوو! دراوسێ وا بەدراوسێی دەڵێ:

کابرای بەساڵا چوو گوتی:

- بەهیچ مانایەك نەبوو..بۆیە وام گوت چونکە ئەم خانووە دزی دێنێ!

دز دێتە ماڵەکەی ئێمەو ناچێتە ماڵەکانی دیکە!..یانی چی؟

دڵم گوشرا، بۆ جگەرەکڕین چوومە دوکانەکەی سەری کۆلاّن.گوتم:

- پیاوی واهەیە قسەی خۆی نازانێ!

دوکاندار گوتی:

- خێرە؟

گوتم:

- لای ماڵی ئێمە پیرە پیاوێکی خەڵەفاو هەیە ، دەڵێ( ماڵەکەی ئێوە دزی دینێ، بەکرێتان نەگرتبا باشتربوو)

دوکاندار گوتی:

- راستی گوتووە ئەو خانووە دزی دێنێ، نەتان گرتبا باشتربوو.

بێ ئەوەی هیچ بڵێم لەدوکان بەدەرکەوتم. ئەو رۆژە تا ئێوارە سەخڵەت و نیگەران بووم.شەو دراوسێی دەستەچەپ سەردانیان کردین. لە نێو قسەو باس و خواساندا،گوتیان:

-ئێرە خانووی باشە بەلاّم دزی دێنێ..

کە رۆیشتن و بەڕێمان کردن لەبیرم چووپرسیاریان لێ بکەم و بڵێم:(بۆ دز دێنە ماڵەکەی ئێمە و

نایەنە ماڵی ئێوە؟)
ژنم زانی نیگەرانم، پێکەنی و گوتی:
- کوڕە،تێناگەی.. کرێچی دەرپەڕاندن هەزار ڕێگەی هەیە.ئەمەیش یەکێکە لە ڕێگەکان. دەمانترسێنن بەوەی دزمان دێنە سەر تا دەربچین چونکە خانووەکە هەرزانەو بۆخۆیان یا بۆ ناسیاویان دەیانەوێ.
کەمێك هێور بوومەوە، بەڵام خەو چیە نەچووە چاوم، وەك دز وادەی هەبێ و چاوەڕوارن بم ها هات ،ها وا دێ!
نازانم خەوم لێ کەوتبوو یا وەئاگابووم کە لەناکاو راپەڕیم و دەستم بۆ دەمانچەی ژێر سەرینم بردو هاوارم کرد:
- نەبزوی ئەگینا لێت دەدەم!
لە نێو تاریکیدا ئەو دیوارو ئەم دیوار بەدووای سویچی کارەبا دەگەڕێم و نایدۆزمەوەو وەك شتێك لە قاچم ئاڵا بێ تەپەم لێوەهات و کەوتم و دەمانچەکەم لەدەست دەرپەڕی.
- ها..ها..ها..
درایە قاقای پێکەنین.. هاوارم کرد:
- کوڕە فلیمی ترسمان نیشان دەدەی؟ ئەگەر پیاوی دێیتە بەرامبەرم.
دەنگەکە لە تاریکیدا پێدەکەنی،دیسان هاوارم کرد:
- تۆ نازانی من چ لە پیاو دەکەم؟
کابرا:
- دەزانم..بەڵام بەیارمەتی خۆتان با کارەباکەتان بۆ داگیرسێنم.
چت، دەنگی سویچی کارەبا هات و ژوور روناك بوو. من چووبوومە ژێر مێزو ژنیشم لەژێر قەروێلە بوو. زەلامێك لەسەرسەرم وەستاوەو دەرفەتی هەڵسانم نیە.هەر لە شوێنی خۆمەوە دەنگم دا:
- تۆ کێی ؟
- دزم.
- تەماشا، من هەڵناخەڵەتێم، تۆ دزنی، بەم فێڵە دەتەوێ لەم ماڵەمان دەربکەی؟.
کابرا:
-دزبم دز نەبم ،ئێستا دەبینی.
وەك ماڵی باوکی بێ، دەستی کردە پشکنین و شت کۆکردنەوە. بەدەم مەشغەڵەتیش دەیگوت:

-دیارە ئێوە ئەم ژوورەتان کردووتە هی نووستن.کرێچی بەر لە ئێوە کردبوویانــە هــی دانیشــتن، ئەوانی پێشی ئەوانیش هەر وایان کردبوو.
- بزانە تۆ ئێستا دزیمان لێ دەکەی بەڵام من شکاتت لێ دەکەم.
بێ ئەوەی دەست لە کاری هەڵبگرێ گوتی:
- برۆ لای باوکت شکاتم لێ بکەو سڵاوی منیشی پێ ڕابگەینە.
- ئاخر تا من دەچمە پۆلیسخانە شکات بکەم تۆ ڕادەکەی!
-راناکەم.
-نە بەخوا ڕادەکەی. چ لەمماڵەدا هەیە کۆی دەکەیەوەو بۆی دەردەچــی.ئەگەر راســت دەکــەی وەرە دەتبەستمەوە تا دەچمە پۆلیسخانە.
ژنم هاواری کرد:
- هیمداد..
خەڵکی گەڕەك رژانە بەر دەرگای ماڵەکەمان بەڵام کــەس نەهاتــە هیمــدادمان و لەنێوخۆیانــدا دەیانگوت:
-دیسان دز هاتووتە ئەم ماڵە.
هەندێکیان پرسیاریان لە یەکتری دەکرد:
-ئاخۆ کامیانە؟
لەنێو دراوسێکانماندا هەندێك دزیان دەناسی و چاك و چۆنیان لە گەڵ دەکرد.
گوتم:
-دراوسێ یارمەتیمان بدەن ئەم دزە ببەستینەوە.. دەچین ئاگاداری پۆلیسخانە دەکەین.
یەکێك لە دراوسێکان:
-ئێوە خۆتان باشتر دەزانن ، بەڵام بێهوودە خۆتان زەحمەت دەدەن!
بزانە ئێمە هاتووینەتە چ گەڕەکێك؟ ژنم پەتی جل هەڵواســینی هێنــاو دزیــش خــۆی ســەخڵەت نەکردو زۆر بە جوانی دەســت و پێمــان بەســتەوەو لــەژوورێکمان دانــا و دەرگامــان کلیــل داو یەکسەر بەرەو مەخفەر ڕامان کرد. ژنم تەواوی رووداوی لە کۆمیسێر گەیاند. کــابرا ئەدرەســی ماڵەکەی ئیمەی پرسی،پاشان گوتی:
-هاااا ، ئەو ماڵە؟
گوتم:-بەڵێ ئەو ماڵە.
گوتی:

- هەقمان وەسەر ئەوماڵەوە نیە، لە ناوچەی ئێمەدا نیە!
-باشە ئەی چ بکەین؟ لە خۆڕایی کابرامان بەستوٚتەوە..
-ئەگەر خانوێك لەسەرەوەتر بوایە، ئەوە دەکەوتە ناوچەی ئێمەو ئەوکاتە ئەرکی خۆمان دەبینی.
ژنم گوتی:
-چی بکەین خانووی چۆڵ لەسەرەوەتر نەبوو.
ماڵەکەی ئێمە کەوتووتە نێوان سنووری دوو پۆلیسخانە. کۆمیسێر گوتی:
-ماڵکەی ئێوە عایدی.... پۆلیسخانەیە.
ئەو پۆلیسخانەیەی وا باسی لێوە دەکا دوورەو خەریکە وا رۆژ هەڵدێ. چووینە ئەویش . پرسیاری ئەدرەسیان کرد،هەرکە هەڵماندا، پۆلیسێك گوتی:
-هاااا، ئەو ماڵە؟
-بەڵێ خۆیەتی.
- ئەگەر خانوێك لە خوارتر دەبوو، ئەوە دەکەوتە ناوچەی ئێمەو ئەو کات دەهاتین.
ژنم گوتی:
-ئاخ، ئاخ، کابراشمان لە خۆڕایی بەستەوە..
پۆلیس گوتی:
- ماڵەکەی ئێوە دەکەوێتە سنووری ناوچەی جاندرمەو، پۆلیس هەقی بەسەریەوە نیە، سەرێکی مەخفەری جاندرمە بدەن.
بەڕی کەوتین..ژنم گوتی:
-کورە با سەرێکی ماڵەوە بدەین بزانین دز ماوە مردووە؟
راست دەکا..ئەوە کابرا مرد ؟ لەسەر ئێمە ساغ دەبێتەوەو دەبینە پیاوکوژ.هاتینە ماڵەوە. دز لە جێگەی خۆی نەجوولاوەتەوە..گوتم:
-چۆنی؟
-باشم، بەلاّم زۆرم برسیە.
ژنم خواردنی بۆ دز ئامادەکرد. تەماشای ئەم بەلاّیە بامیەمان هەیەو دز بامیە ناخوا! ناچار هەندێ گۆشتی کوێلەکەی لای قەسابی سەری کۆلاّن کڕی و بۆی سوورکردەوە.دز خەریکی خواردن بوو ، ئێمەیش بەرەو مەخفەری جاندرمە.هەرکە وەسفی ماڵەکەمان بۆ کردن و گوتیان:
هاااا، ئەو ماڵە؟
تەواوی خەڵکەکە ماڵەکەی ئێمە دەناسن.بەرپرسی مەخفەر گوتی:

- ماڵەکەی ئێوە عایدی جاندرمە نیە، عایدی پۆلیسە.
-دەخیلە، دەچینە لای پۆلیس دەڵێن عایدی جاندرمەیە، دێینە لای ئێوە دەڵێن عایدی پۆلیسە، ماقووڵ نیە ئەو ماڵەی ئێمە سەر بە لایەنێك نەبێ!
بەرپرس نەخشەیەکی دەرهێنا:
-تەماشاکەن، ئێوە سەرتان لە نەخشە دەردەچێ؟ ئەمە خاڵی ١٤٠ی تەسویەیە.ئێرەیش ئاستی ئاوە. ئێرەیش خاڵی ٢٠٨ گردەو ناوچەی کاروبارو چالاکی جاندرمە دەکەوێتە ئێرە.ئەگەر ئەو ماڵەی ئێوە بەکرێتان گرتووە، دوو میتر لە باکووری رۆژهەلات دەبوو، ئەوە دەبووە عایدی ناوچەی جاندرمە.
- هەردوو میتر؟ بەگەڵی بخەن چ دەبێ؟
- چ دەبێ؟ ئێوە نازانن ئێمە خۆمان دەزانین(نەخشەی نیشان داین)سەیرکەن.ماڵەکەی ئێوە دەکەوێتە خاڵی سنووری نێوان جاندرمە و پۆلیس، تێگەیشتن؟ دوو میترو نیو لە باخچەی ماڵکەتان دەکەووێتە سنووری ئێمە بەڵام خۆ دزی لە باخچە نەکراوە؟
دەرمانی دەرد هەر ئەوەیە جارێکی دیکەیش بچینەوە پۆلیسخانە.
ژنم گوتی:
-پیاوی چاك بە با سەرێکی ماڵەوە بدەین. بەخوا دزە شتێکی لێ بێ قورمان وەسەر دەبێ.
هاتینەوە ماڵ. بەدزم گوت:
- چونی؟
- سوتام، بەپەلە ئاوێکم بدەنێ.
دووای ئەوەی ئاوی نۆشی، گوتی:
- ها پێتان بڵێم، ئێوە مافی ئەوەتان نیە ئازادیم غەسب بکەن. لێرە رزگارم بێ شکاتتان لێ دەکەم.
- برا ئەی چی بکەین؟ ماڵەکەی ئێمە مەعلووم نیە عایدی کام ناوچەیە، تا لەوێ شکاتت لێ بکەین. ماڵ لەسەر ئەدەبخانەی وا دروست دەکرێ؟ تەواو کەوتووتە سەر سنوور.
- ئەی پێم نەگوتن؟ بەخوا ئەگەر ئازادم نەکەن لە دادگادا شکاتتان لێ دەکەم.
گوتم:
-تا ئێوارە سەبرمان لێ بگرە، جارێکی دیکەیش دچینەوە پۆلیسخانە .
-بۆکوێ دەچن بچن.ئێمە دمێکە بەم مەسەلەیە دەزانین. تا بڕیاری ئەوە دەدەرێ ماڵەکەتان دکەوێتە کام ناوچە؟ سنووری جووڵەکە دەگوڕێ، تا ئەو کاتەیش،هایهوو،هایهوو..
چووینەوە پۆلیسخانە، کۆمیسێر نەخشەیەکی دەرهێناو گوتی:

- تەماشاکەن، سنووری جاندرمە تا ئێرەیە، باخچە عایدی ئەوانە، بەشێکی ماڵەکەیش بەرئێمە دەکەوێ.
گوتم:
- ژووری نوستن دەکەوێتە سنووری ئێوە، دزیش لە ژوورە کراوە.
گوتی:
- بەڵێ ،بەڵام پێویستی بە (تەسبیت) هەیە،پاشان خۆ دز بەفڕین نەچووتە ژووری نوستن؟ لەباخچەوە چووتە ژووری، باخچەیش هی جاندرمەیە. ئەمە مەسەلەیەکی تازە نیەو کێشەی لەسەرەو لە گفتوگۆدایە .کە بڕیار دەدرا ماڵ سەر بەکام ناوچەیە ئەو کات ئێمەیش بەپێی بڕیار هەڵسوکەوت دەکەین.
گەڕاینەوە ماڵ. هەمان پیرە پیاوی گۆڕین سەری لە پەنجەرەی ماڵەکەی خۆیا دەرهێناو گوتی:
-سەرتان ساغ بێ، دیارە دز هاتووتە ماڵەکەتان؟
گوتم:
- بەڵێ تەشریفی هێناوە!.
- هیچ کرێچییەك لەم خانووە دانانیشێ بۆیە خاوەنی وا هەرزانی دەدا.خۆیشی لەناوی دانانیشێ. ئەگەر دوو میتری دەرووخاند ئەوە مەعلووم دەبوو سەر بەکام ناوچەیە.
مام یەختیار درێژەی دایێ:
- گوناهی ئێوە نیە، هەمووی لەژێرسەری خاوەن خانووە. ئاوی ، کارەبای، گازی، زێرابی، هەمووی بەلاشەو نازاندرێ سەر بەکام لایە. توخوا کەس خانووی لەسەر سنوور دروست کردووە؟
هاتینەوە ماڵ. ماوەی ساڵێك پێشین کرێمان داوەو ناکرێ چۆڵی بکەین. دزمان ئازادکردو نانی ئێوارەیشمان بەیەکەوە خوارد.وادەی ڕۆیشتنی هات دز گوتی:
- جارێ بەخواتان دەسپێرم، ئیشالاّ بەم زووانە دێمەوە!
حاڵی حازر چوار پێنج دز فێری ماڵەکەی ئێمە بووینەو خەڵکی گەڕەك دەیانناسن وتەنانەت هەندێ ئیشوکاریشمان بەیەکەوەکردووەو ئەو کەلوپەلەی لە خەڵکی دەدزن لە ماڵەکەی ئێمەی دادەنێن.بابزانین چۆن دەبێ؟ تا وادەی کرێمان تەواو دەبێ ئەوە من وژنم لەگەڵ شەش دز دەژین و دادەنیشین، یانیش ئەگەر مەعلووم بوو ماڵ سەربەکام ناوچەی حکوومەتە ئەوە شکاتیان لێ دەکەین، چونکە بەشێکی ماڵەکە بوویتە میوانخانەی ئەوان و هەندێ مەسرەفی ڕۆژانەیش لەسەر ئەوانە!!

# ماڵێکی بێ دەنگ

گوتی:

- زۆر جوان دەنووسی.

هەوەڵ گەلی برایانی نووسەر ئاسا ،گوتم: سپاست دەکەم .پاشان گوتم:

- ماڵەکەم گونجاونیە ئەگینا جوانتریش دەنووسم .

- چۆن؟

- چۆن و مۆنی دەوێ؟ ماڵ بچکۆڵانەوخێزانیش ماشەڵڵا فرە زۆرن. خۆت دەزانی نووسینکاری مێشکەو کرو بێ دەنگیی دەوێ. بیرۆکەیەکم بۆ دێ کەچی گێژە بچکۆڵانەکەمان دێ شکات لەبرای دەکا : بابا بۆ پێی ناڵێی؟ بیرۆکە لە مێشکمدا نامێنێ.ئەو کڕ بکەمەوە یەکێکی دیکە دەکاتە هەراو کەللەسەرم کەف دەکا.نووسینی باشیش لەم وەزعەدا نانووسرێ.

گوتی:

- چەند منداڵت هەن؟

- یازدە.

خوا عەفووی بکام گوێ لێ بوو ، پاشان دەنگێك هات وەك بڵێ:

- ووسسسسس

گوتم:

- لەگەڵ منتە؟

گوتی:

تۆش یەکسەر بەخۆتت وەرگرت..

گوتم:

-ئاخر لە من و لە تۆ بترازێن کەسی تری لێ نیە..

گوتی:

- ئەم هەستی وا بەجارێ ناسك باش نیە. بەڕێگەوە بڕۆن دەنگ لە گزۆزی ئۆتۆمبیل بێتە

دەرەوە، دەڵێن: ئەوە بەمنتە؟ من پێم وابوو یەکێك هات بۆیە گوتم ووسسسسس.. با بێینەوە سەر مەسەلەی منداڵ، یازدە منداڵ بۆ نووسەرێك زۆرن، منداڵێکیش زیادە. نووسەر منداڵی نەبێ باشترە ،چونکە کاتی نیە.

- منداڵ بوون هیچ کاتی ناوێ..

گوتی:

- بۆ نووسەر منداڵی نەبێ ؟ چونکە هەموو کەس دەتوانێ منداڵی هەبێ بەڵام هەموو کەس ناتوانێ کتێبی هەبێ

گوتم:

- چی بکەم وا خاوەن یازدە منداڵم، بڵێ یازدەو نیو، منداڵێکی دیکە بەڕێوەیە.

- هەمووشتان لەیەك خانوودا دەژین..کتێب بە چەند ساتە وەخت دادەنێی؟

- مێشکم ئەوەندە بابەتی تێدایە، ئەگەر لە ماڵێکی کڕو هێمندا دەبووم، ئەوە هەر دوومانگ جارێك کتیبێکم دادەنا..

گوتی:

- ئەوە دام و بڕایەوە..بۆ شەش مانگ ماڵەکەی خۆم دەدمە تۆ .

پێم وابوو کابرا هەوەنتان دەکا، بەڵام کە بە ئۆتۆمبیلی خۆی منی بردە ماڵەکەی باوەڕم کرد.ماڵ چ ماڵ! کۆشکێکی زەلام. گوتی:

- ئێمە زستان لە (نیشانتاش)دا بەسەر دەبەین، تا مانگی گوڵان ماڵ هی تۆیە، دەکا شەشە مانگ. دەفەرموو بزانم چ شاکار دەنووسی! لانی کەم با منیش لە دنیای ئەدەبیاتدا بەشداربم.

بەسەرسوڕمانەوە دیقەتی کۆشکم دەدا. گوتی :

- تەنیا تکایەکم هەیە. گورگە سەگێکم لە باخچەدایەو تووڵەکەیشی لە نێو ماڵەو لە سالۆنیشدا کەناری یەك هەیە، ئەگەر ئاگاداریان دەبووی مەمنوونت دەکردم.

گوتم:

- مەمنوونی ناوێ، من بۆخۆم ئاژەڵم خۆش دەوێ.

کابرا کۆشکی بۆ من جێهێشت و ڕۆیشت. باوەڕم نەدەکرد ئەگەر بە خەونیش بووایە.

سەرلە نوێ لەباخچەوە پێدا هاتم و تەواوی کۆشك گەڕام. ماڵێکی کشومات و بێ دەنگ. چوومە نهۆمی سەرەوە و لە پەنجەرکانەوە دیمەنی جوان و دڵڕفێن دیارن. هەرکە لە بان مێز دانیشتم لەبەر خۆمەوە گوتم:

- کوڕە، لێرە کەریش دەبێتە شاعیر..

بەپەلە قەڵەمم دەرهێناو هێشتا نەمخستبووە سەر کاغەز کە زەنگ لێیدا.ئاوڕی ئەولام دایەوە، هی ئەملا، نەمزانی دەنگ لە کوێوە دێ.تەواوی ژوورەکانی نهۆمی سەرەوەم پشکنین، هیچ نیە، کەچی زنگ بەردەوامە..گوتم ڕەنگە زەنگی تەلەفۆن بێ. لە نهۆمی ناوەڕاستدا تەلەفۆنم دۆزیەوەو بەبناگوێی خۆمم وەنا دەنگ نیە ، کەچی زەنگ هەر لێدەدا.دەبێ تەلەفۆنێکی دیکەیش لەمماڵەدا هەبێ؟

ڕاکە بۆ ئەملا ، ڕاکە بۆ ئەولا، تێگەیشتم بەڵێ زەنگی دەرگایە.. ڕۆژنامەفرۆش بوو..گوتم:

- ئیدی لەمەولا پێویستم بە ڕۆژنامە نیە.

دەرگام داخست و گەڕامەوە.. هێشتا بەتەواتەتی لەسەر مێز دانەنیشتبووم، دووبارە زنگ لێیداوە.لە پلیکانی دوو نهۆماندا دابەزیم، ئەمجارە کەس لەبەر دەرگادا نەبوو. تۆ بڵێی منداڵ بووبن؟ زەنگ بەردەوامە. دەرکەوت زەنگی دەرگای دوواوەی لای باخچەیە. شیرفرۆشە..گوتم:

- پێویست ناکات، لەمەودا شیرمان بۆ مەهینە.

گوتی:

- پارەی هەفتەیەکتان لەسەرە.

کابرا شەش مانگ ماڵی بۆ من جێهێشتووەو کرێی ناوێ.. پارەی  شیری هەفتەیەکم دا!

وەسەرکەوتمەوە بان.. قەڵەمم نەگەیاندبووە کاغەز ، کە جارێکی دیکەیش زەنگ شیڕاندی.بەڕاکردن هەوەڵ دەرگای پێشەوە، پاشان هی دوواوەم کردەوە، کەس نیە..

ئەم کۆشکە چەند دەرگای هەیە؟

ئەو لاو ئەملام کرد،کەس نیە.گوتم ڕەنگە منداڵ وتواڵ بن نارِحەتم بکەن. تا من دەرگای پێشەوە دەکەمەوە ئەوان هی دوواوە لێدەدەن،.بافێڵیان لێ بکەم، ئەگەر هی پێشەوەیان لێدا من دەرگای دوواوە دەکەمەوە..دەرکەوت نەخێر زەنگی تەلەفۆنە..

- هەلاو .. فەرموون

- بی زەحمەت نازان خانمان دەوێ.

- قوربان لە ماڵ نیە.

گەڕامەوە سەر مێز، هەر دانیشتم و دانەنیشتم دووبارە زرەی هات. هەوەڵ رامکردە لای تەلەفۆن، تەلەفۆن نیە..دەرگام کردووە، پۆستەچی بوو.. نامەم وەرگرت وسەرکەوتمەوە، دیسان

زەنگە. هەردوو دەرگاکانم وەسەر کردنەوە دەرگانین، تەلەفۆنیش نەبوو.. ڕاکە بۆ سەرەوە، ڕاکە بۆ ژێرەوە، سەیر دەکەم دەنگی باڵندەیە:

- گۆگ..گۆگ..گۆگ..

دەنگی سەعاتە. دووسەعاتیان بەدیوارەوەیە، یەکیان زنگەو ئەوی دیکە دەنگی باڵندەیە.کە سەرە سەعات تێپەڕی کرد، ئەوانیش لە لێدان کەوتن. ئەمجارە تەلەفۆن لێیدا:

- بێ زەحمەت نازان خانمان دەوێ.

- قوربان نازان خانم لە ماڵ نیە، چوونەتە ئیستانبووڵ

دەنگی زەنگە لە سەرەوەو لە خوارەوە. ئەوەندە بەملاو ئەولادا ڕامکرد ئارەقم کرد. لە ناوەڕاستی هۆدا چەقیم..

- دان..دان..دان، دەنگیکی لەم نەزمە.

من تێناگەم لە ماڵێکدا چەند دانە زەنگ دەبێ، چەند دانە دەنگ دەبێ ، چەند دانە سەعات دەبێ! ئەمجارە سەعاتەکان لێ دەدەن . ڕاکە بۆ ئەملا، ڕاکە بۆ ئەولا، مردم.

جارێك ئەم دەرگایە لێدەدرێ، جارێکی دیکە دەرگای تر. بۆ تەلەفۆن ڕادەکەم ، سەعاتە. بۆ سەعات ڕادەکەم دەرگایە.. ئەمجارە سەرم لێ دەشێوێ و نازانم دەنگی چیە ، هەر لە زەنگی پاسکیلی منداڵان دەکا.

ئێوارە داهات، ووشە چیە نەمنووسیوەو ڕۆژم بەڕاکردن بردە سەر..رەنگە چل جاران وەڵامی تەلەفۆنم دابێتەوە.. هەرچی کاڵافرۆشی مەعمیلە لە دەرگای داوە.

چەشنی پیاوی مردوو خزیمە نێو وەتاغ و خۆم بە خۆمم دەگوت:

- دەی ،یەکەم ڕۆژ هەروا دەبێ. ئێستا هەموو تێگەیشتن کەس لە ماڵ نیە. بەیانی ئیدی دەرگا لێنادرێ و تەلەفۆن ناکرێ، ئەوکات منیش خەریکی نووسین دەبم.

سەرم خستە سەر سەرین دەنگێك هات، بەڵام دەنگی زەنگ نیە چونکە گوێچکەم بە تەواوی لە زەنگەکانی دەرگاو تەلەفۆن و سەعات راهاتووە و دەیانناسێتەوە.مییك، مییك، مییك.. شتێکی لەم نەزمە.جارێکی دیکەیش ژوورەکانی کۆشکم بشکنین. توولە سەگەکە نەبێ ؟

دەرگای حەمامم کردەوە،توولە من بینی بێ دەنگ بوو، خۆی تێهەڵدەدایە سەر قاچەکانم ، تومەز برسیە.چم لە مەتبەق دۆزیەوە لەبەردەمیم داناو چوومە ناوپێخەف.

زەنگ وەستاون بەڵام سەعات و سەگ ناوەستن و تەلەفۆنیش بەردەوام لێدەدا. کات نیوەی

شەوە،لە توولە سەگ دوور دەکەومەوە دەست بە مییکە مییك دەکا. بردمە ژووری نوستن، هەر کڕنەبۆوە، ناچار لەگەڵ خۆمدا خەواندم .
ئەمجارە نۆرەی گورگە سەگەکەی باخچە بوو:
- حەو حەو حەو..
خەریکە شێت دەبم:
- ووس بە هەی سەگی کوڕی سەگ..ووس بە !
پەنجەرە دەکەمەوە لە سەگ رادەخوڕم، توولە سەگ دەست پێدەکا. حەپەی سەگ و زنگی سەعات تێکەڵ بەیەکتری دەبن، کە بەیانیش خۆر هەڵات مریشك و کەڵەشێر بە باخچە وەربوون و کردیانە قرتە قرت:
- جییك جییك جییك..
قەفەزی کەناریم کردە حەمام و دەرگام گاڵەدا.. دە دەقیقەیەك یا کەمتر چاوم نەچوبووە خەو کە دیسان زرەی هات.وەك هۆشم بێتەوەبەر وابوو. کوانێ منداڵەکانم؟ قوربانتان بم، هەرنەبێ کە لێم ڕادەخوڕین ووس دەبوون، بەڵام سەگ و مریشك و زەنگ کڕ دەکرێنەوە؟
باشە بەدوو کەس لەم کۆشکەدا چۆن فریای ئەم هەموو زنگانە کەوتوون؟
گوتم واباشە بڕۆمە لای ئەم برادەرم کە چاکەی لە گەڵدا کردووم ئەم ماڵە بێ دەنگەی داومەتێ و پێی بڵێم:
- کاکە من پەشیمانم.. فەرموو بۆخۆت یەکێك بەکرێ بگرە ئاگای لە ئاژەڵ و باڵندە بێ .
سەرێکی کووچەم دا ، تووشی کابرایەك هاتم، گوتی:
- بەخێر هاتی، ئەم زستانە تۆ نۆبەتداری کۆشکی؟
دڵتەنگ و بێزار بووم، بۆ ئەوەی کابرا لە کۆڵ خۆم بکەمەوە، گوتم:
- بەڵێ.
- بەچەند؟
- چ بە چەند؟
گوتی:
- ئاگادار بە بە هەرزان نۆبەتی لێ مەگرە. پار بە پێنج سەد هەزار لیرە نۆبەتدارێکی گرت، کابرا ئەوەندەی نەمابوو شێت بێ. ئەم کۆشکە بە کۆشکە زەنگ بە ناوبانگە.

بەپەلە خۆم گەیاندە نووسینگەی کابرای چاکەی لە گەڵدا کردووم، زەلامێکیشی لا دانیشتبوو..
گوتم:
- کۆشك نە جنۆکەو، نەئینسۆکەی تێدایە، زۆر بێ دەنگ و کڕە خەریکم بەتەنیا دەتەقم.
گوتی:
- دەمزانی، تۆ لە شوێنی بێ دەنگ و کڕدا ناتوانی ئیش بکەی.. من ئەم نووسەرانە دەناسم! ئەگەر شوێنێکی بێ دەنگمان دەسکەوێ وا دەنووسم ، وادەکەم.. کە شوێنیشیان دەست کەوت، دەڵێن لە بێ دەنگییان بێزار بووین.ئەمانە وان هیچیان لەباردا نیە.
نەبادا مقەدەرێکم لە دەست ڕووبدا ، هاتمە دەرەوەو گەڕامەوە ماڵەکەی خۆم ..ئۆخەی. بەڵام هەنووکەیش زەنگم لە مێشکدا دەزرنگێتەوە.